## هەندێک زانیاریی گشتی

# لە بارەی زمانەوە



شاسوار هەرشەمی

کوردۆلۆجی

هەرێمی کوردستان
سەرۆکایەتیی ئەنجومەنی وەزیران
مەڵبەندی کوردۆلۆجی

- ناوی کتێب: هەندێك زانیاریی گشتی لەبارەی زمانەوە
- نووسەر: شاسوار هەرشەمی
- پیتچنین: نووسەر
- دیزاین و سەرپەرشتیی چاپ: بریار فەرەج کاکی
- بەرگ: کمال علی
- ژمارەی سپاردن: ١٣٣٦/ ساڵی٢٠٠٩
- چاپخانە: رەنج/ سلێمانی
- تیراژ:١٠٠٠ دانە
- نرخ: ٢٥٠٠ دینار
- زنجیرە: ٢٤

مەڵبەندی کوردۆلۆجی
ناونیشان: سلێمانی، گردی ئەندازیاران- گەڕەك/ ١٠٥، کۆڵان/ ٢٥، ژ.خانوو/ ٤، ژ. پۆست/ ٩٥
تەلەفون: ٣١٩٣٠٩٣
www.kurdology.com
kteb@kurdology.com

# ناوەڕۆك

# پێشەکی

زمــان، جــاران هۆکــارێکی گــرنگ و چارەنووســـاز و بڕیــاردەر و یەکلاکــەرەوەی، خۆپاراستن و گەشەکردنی هەر نەتەوەیەك بوو.

ئەمڕۆ، زمان دەبێ ئەو ئەرکە مێژوویییەی خۆی بەسەرکەوتویی بردبێتە سەر، تا خۆی بۆ سەردەمێکی تری گرنگ و یەکلاییخەرەوە، ئامادە کردبێت،

ئـەمڕۆ، ئـەرکی هـەرە گرنگـی زمـان، گەشەسـەندن و چوونەپێش و پێـشکەوتنێکی هاوتەریبە لەگەڵ گەشەسەندن و چوونەپێش و پێشکەوتنی زانست و تێکنۆلۆجیـادا. ئـەو زمانەی ناتوانێت وەڵامدەرەوەی ویست و خواسـت وداواکـاری قـسەپێکەرانی بێـت، لـە ئاست زانست و تێکنۆلۆجیای سـەردەم، ئـەوا بێگومـان، لـە کـاروانی زمانـانی زینـدو و چـالاك دادەبڕێـت. مرۆڤــی کـورد، وەکـو گـشت مرۆڤـەکانی تـر، نـاتوانێ لـە دنیـای پێشکەوتو، دابڕێ و خۆی دوورە پـەرێز بگرێـت. خۆگونجانـدن لەگـەڵ کـاروانی زانـست و تێکنۆلۆجیا پێویستی هەموو تاکێکە، ئەگەر زمانێك نەتوانێ ئـەو داخوازیانـەی تـاك و کۆمەڵەکەی بەجێبێنێ، ئەوا ئەو زمانە وەکـو هۆکارێـك پـەکی دەکـەوێت و مەیـدان بـۆ زمانێکی تـر چـۆڵ دەکـات. هـەر ئێـستا چـەندان زمـانی جیهـان، لـەناو ئـەو پرۆسێـسە مەرگبارەدان و لە گیانەڵادان.

دەبێ ئێمە لە خەوی خۆشی، هێشتا زیندووی زمانەکەمان، بە ئاگا بێینەوە، هـەموو ئەو زمان و زاراوانەی کە توانیویانە تـا کۆتـایی سـەدەی بیـستەم زینـدوو بمێـنن، ئیـدی دەکرێ گفتی ئەوەیان پێبدرێت کە بۆ هەمیـشە بـە زینـدوویی دەمێننـەوە بـەڵام زینـدوو مانێکی تەکنیکی. واتا ئەمڕۆ بواری تێکنۆلۆجی، بۆ هەموو زمانێکی سەر گـۆی زەوی رەخساوە، تا وشەو رسـتە ودەق و دەنـگ و ئیدیۆمـەکانی، بـە تۆمـارکراوی بخاتـە سـەر میکرۆ فیلم، یان خەپلەیەکی بچووکی ئەلەکترۆنی و لـە نـەمان و لەناوچوون بیپـارێزێ. بۆیە نابێـت دڵمـان بـەوە ئـۆقرە بگرێـت و بڵـێین، ئۆخـەی زمانەکـەمان چـیتر هەڕەشـەی لەناچوونی لەسەر نەماوە و ئەو قۆناغە مەترسیدارەی بڕیوە.

ئەمڕۆ نەوەی نوێ، چاوەڕوانی گەورەی لە زمان هەیە. بۆ ئەوەی زمانەکەمان ئەرکی خۆی بەجێ بێنێ و بتوانێ وەڵامی خواستەکانی سەردەم بداتەوە، دەبێ چەندان کۆڕی زمانەوانی، شەو بخەنە سەر ڕۆژ و خەریکی کاری ورد و بەردەوام بن، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو هەڵبژاردنی و شەو زاراوەی پێویست بۆ هەموو دیاردە زانستی و تێکنۆلۆجی و کۆمەڵایەتیە تازەکان. ئەگەر ئەم کارەمان بۆ نەکرا، ئەوا ئیدی خۆشەویستی ڕووت و هەست و سۆزی نەتەوایتی بەس نین بۆ لەسەر پێ ڕاگرتن و چالاک کردنی زمانەکەمان.

خەڵك، هەروەك چۆن لەگەڵ مەرگی نزیکان و خۆشەویستانی ڕادێ و ناچار دەبێ بە دوای ژیانی پڕ لە جەنجاڵی خۆی بکەوێ، ئاواش ڕۆژانێك دێ، ناچار دەبین پشت بکەینە زمانە خۆشەویستەکەمان، تا بتوانین پێویستیە زانستی و تەکنەلۆجیەکانی خۆمان لە ڕێگای زمانێکی ترەوە دابین بکەین.

مەبەستی سەرەکی من لەم کتێبە ئەوەیە کە خوێنەر وشیار بکەمەوە کە زمانیش دیاردەیەکی مێژووکردی دەستی مرۆڤە. ئێمە خۆمانین چارەنووسی زمانەکەمان دیاری دەکەین. مەبەستم لە ئێمە، تاکەکەس، کۆڕو کۆمەڵ، دامەزراوە ئەکادیمیەکان و زانکۆ و ئامۆژگاکان، پارتە سیاسیەکان، دەزگاکانی ڕاگەیاندن و دامەزراوەکانی حکومەت و دەسەڵات هەمووە، دەبێ هەموومان وشیاریی زمانەوانیمان لە ئاستێکی بەرزدا بێت و هەست بە لێپرسراوی سەر شانمان بکەین. ئەگەر نەمانتوانی زمانێکی پاراو وگونجاو لەگەڵ پێویستی و داخوازییە زۆر و زەوەندەکانی سەردەم، بێنینە کایەوە، ئەوا سەردەستەی کۆمەڵ، بە ناچاری پەنا بۆ زمانانی تر دەبەن، یاخود لە کاروانی پێشکەوتن دادەبڕێن. زمانێکی لە کاروان بەجێماو، شایانی میللەتێکی لە کاروان بەجێماوە، ئەوانەی ئەمڕۆ جگە لە زمانی کوردی، ئاشناییان بە زمانی تری زیندو و هاوچەرخ نییە، ناتوانن سەر لە زۆر تێرمی تازە و هاوچەرخ دەربکەن، بەمەش تاکی ناو کۆمەڵ، نەك هەر ناتوانێ وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی سەردەمی خۆی بێت، بەڵکو کاریگەری چالاکیشی لەسەر دەوروبەری خۆی نابێت. ئاگاتان لە زمانەکەتان بێت، دڵتان بەوە خۆش نەبێت کە زمانی کوردی تا ئیستا زیندووە. هێشتا کاروانێکی سەخت و درێژمان لەپێش ماوە. بڕیاری چارەنووسسازو گرنگ دەبێ لەسەر دەستی نەوەی ئێستا بدرێت. بڕیاری گرنگ ئەوەیە کە ئێوە لە خۆتان ڕادەپەڕمون تەکانێك بە زمانەکەتان بدەن؟

ئەگەرنا زمانەکەمان دەخرێتە سەر خەپلەیەکی ئەلەکترۆنی تا دوای چەند سەد ساڵی تر، لێکۆڵەران چیرۆکەکەی بنووسنەوە.

مەبەستی من لە گێڕانەوەی چیرۆکی زمانانی زیندو و لەناوچوو لەم کتێبەدا، ئەوەیە ئاگادارتان بکەمەوە کە ئەمە خوداو پیاوچاکان نین زمانان دەپارێزن و گەشەیان پێدەدەن! یان سزای دەدەن و لە ناوی دەبەن! وەك لە خوێندنەوەی کتێبەکەدا بۆتان دەردەکەوێت. هەوڵ، یان هەڵەکانی مرۆڤ و ئەو دامەزراو و دامودەزگایانەن کە مرۆڤ دروستی کردوون، وا دەکات زمان بەرەو چ ئاقارێك هەنگاو باوێت.

زمانەکەمان، وەك هەر زمانێکی تری سەر گۆی زەوی، کەرەستەیەکی خاوی زۆر گرنگە، گەورەترین داهێنانی بیر و هۆشی باوك و باپیرانمانە، لە پرۆسەیەکی مێژوویی دوورو درێژ و ئاڵۆز بەو بارەی ئێستای گەیشتووە. ئەوا ئێوەن کە بڕیار دەدەن، پەرە بەداهێنانی هاوبەشی بیرو هۆشتان بدەن، یان سەرشۆڕی نەوەکانی پێش خۆتان دەبن و ناتوانن زمانەکەتان بۆ نەوەکانی داهاتووتان جێبێڵن. پرۆژەی نووسینی ئەم کتێبە بۆ سەرەتای پێشمەرگایەتیم دەگەرێتەوە. واتا ۲۷ ساڵ پێش ئێستا دەستم بە کۆکردنەوە و تۆمارکردنی هەندێ لە بەشەکانی ئەم کتێبە کردووە. بەداخەوە لە کیمیابارانکردنی دۆڵی بالیسان (۱۷/ ٤/ ۱۹۸۷)، بەشێکی زۆری ئەم دەفتەرانەم تێداچوون، کە چەند ساڵێك بوو خەریکی تۆمارکردنیان بووم، ئەوانەی کە توانیم دەربازیان بکەم، لە هەردوو بەشی (ئیتمۆلۆجیای هەندێ وشەی زمانی کوردی) و (لە هەگبەی پێشمەرگایەتیمدا) کۆ کراونەتەوە. یەکەمجار بڕیارم دا ناوی کتێبەکە بنێم (لە سەنگەری زمان) چونکە لە سەنگەری پێشمەرگایەتیدا، هەمیشە شانبەشانی فیشەك، دەفتەری تۆمارکردنی وشە و پەند و بەسەرهات و رووداوە مێژوویەکانم پێبوو. هەرکاتێك تفەنگەکەم پشووی دابا قەلەمەکەم تیژ دەکردەوە. بە هەموو هەستمەوە خۆم لەسەنگەری پاراستنی زمانەکەم دەبینی. دواتر وام بەپەسەند زانی کە ناوی کتێبەکە دەربڕی ناوەڕۆك و ناواخنی کتێبەکە بێت باشترە، نەك هەست و سۆزی خۆم.

هیوام وایە سوودی لێ ببینیت

شاسوار هەرشەمی

ستۆکهۆڵم/ سوید

شوباتی ۲۰۰۸

I

# چەند زانیاریەکی گشتی لەسەر زمان

که بیر لە زمان دەکەینەوە راستەوخۆ ئەمەمان بەبیردا دێت کە ئاخۆ ئەم شەش ملیار مرۆڤـەی سـەر زەوی بە چەند زمان دەدوێن؟

بە گـوێرەی شـارەزایانی نێونەتـەوەیی لانـی کـەم ٤٠٠٠ زمـان لەسـەر زەوی قـسەی پێدەکرێت دیارە ئەم ژمارەیە تا گـونجـاوە کەم کراوەتەوە، دەنـا ژمـارەی راستـــی خـۆی لە ٦٠٠٠ زمـان و سـەروی ئـەمـەش دەدات.

ناکرێ هەروا دانیشی و زمانان بژمێری تا وەڵامێکی دروست یان نزیـك لـە دروسـتی ئەم پرسیارەی سەرەوە نەدەیتەوە. سنووری نێوان زمان و زاراوە روون و دیارنییە. چەندان زمان هەن کە زۆر لێکتر دەچن بەجۆرێك کە ئاخێوەرانی ئەم زمانانـە بـێ گیروگرفـت لـە یەکتری دەگەن وەك (سویدی و نەرویجی، تارادەیەکیش دانیمارکی) لەکاتێکدا دەکرێ ئەو مرۆڤانەی کە بەیەك زمان قسە دەکەن بەسـەختی لـە زاراوەکـانی یـەکتری تێبگـەن یـان لەیـەکتر گەیـشتنیان دەگاتـە رادەی مـەحاڵ وەك زاراوەکـانی زمـانی کـوردی (کـوردی (سۆرانی)، کرمانجی، هەورامی و زازاکی. . . . ) زۆرجار زمـان بـەوە دەناسـرێتەوە کـە ئەوانەی پێی دەدوێن، زمانێکی هاوبەشی نووسـینیش بـەکاردێنن واتـا خـاوەنی زاراوەی جۆراوجۆرن بەڵام یەك زمانی نووسینی هاوبەشیـان هەیە.

دابوونەریتی قوڵی مێژوویی و هەڵسوکەوت و رێورەسمی هاوبەش، رۆڵی گرنگی هەیـە لە دیاریکردنی زمانـدا. ئەمانـەی سـەرەوە دیـسان رۆڵـی دیـار دەبیـنن بـۆ دیـاریکردنی راکێشانی سنوور لە نێوان ئەو زمانە لێکچووانە، یان لێکنزیکانەی کە هێشتا نەبوونەتە زمانی نووسین. سەرەڕای سـەختی دیـاریکردنی زمـانیش، وەك دیـارە خـەڵکان هـەموو دڵنیان کە ئەوانەی تر کێن کە هاوزمانن لەگەڵیاندا.

لە راستیدا بەکارهێنانی میتۆدی زانستی و شیکردنەوەی تاقیگەیی ناتوانێ بە تـەنیا بڕیاردەربێـت لەسـەر دیـاریکردنی سـنووری نێـوان زمـان و زاراوەدا. هەسـت و سـۆزی هاوبەشی کۆمەڵە خەڵکێك، دابوونەریتی هاوبەش و لێکچوو، کەلەپوورو وردەکاریەکانی

ژیانی رۆژانه، بڕیاردەری سەرەکین لەوەی کە کام کۆمەڵە خەڵك خاوەنی زمانی هاوبەشن. با دوو سیناریۆ بێنینە بەرچاومان تا مەبەست روونتر بێت. سیناریۆی یەکەم: سێ کەس بەتەك یەکەوەن. یەکەمیان خەڵکی دیاربەکرە، دووەمیان خەڵکی سلێمانییە، سێیەمیش خەڵکی هەورامانە. ئەگەر لە هەریەکێکیان بپرسین چ زمانێك زمانی زگماك و رۆژانەیانە، ئەوا بێگومان هەر یەکەیان بە شانازیەوە پێمان دەڵێ کوردی زمانی زگماك و رەسەنییەتی سەرەڕای ئەوەش کە دەزانن لە یەکتری ناگەن یان بە ئاسانی لە یەکتری ناگەن.*

سیناریۆی دووەم: نەرویجیەك و سویدیەك بەتەك یەکەوە وەستاون و بەیەکەوە قسە دەکەن. هەر یەکەو بە زمانی باوی خۆی دەدوێ و هەردووکیان بە ئاسانی لە یەکتری دەگەن. کە لە نەرویجیەکە دەپرسین ئایا بە چ زمانێك دەدوێی بێگومان پێمان دەڵێ نەرویجی (سەرەڕای ئەوەش کە خودی زمانی نەرویجی بە دوو زمان دادەنرێ). دیارە سویدیەکەش لە وەڵامی هەمان پرسیاردا پێمان دەڵێ بە سویدی دەدوێ، گەرچی جیاوازی نێوان هەردوو زمانەکە کەمترە لە جیاوازی نێوان هەندێ زاراوەی زمانی کوردیدا*. لێرەدا بە روونی دەبینین کە شیکردنەوەی زانستیانانەی زمانەوانان دەستەوەستان دەوەستێ لە ئاست هەست وسۆز و ویستی خەڵکێکی بڕیاردەر لەسەر ئەوەی بە چ زمانێك دەدوێن. لە بواری وادا ڕێزگرتن لە ویستی خەڵکێك گرنگترە لە بەرەنجامە زانستیەکە. هەندێ جار هەندێ زمان لە جیاتی ئەوەی بەسەر زاراواندا دابەش بکرێت، بەسەر (شێواز)ی لێك نزیك دابەش دەکرێت وەك شێوازی بریتانی و شێوازی ئەمەریکی زمانی ئینگلیزی. هەندێ جار هەردوو زمانە زۆر لێك نزیکەکەی نەرویجیش (زمانی کتێب و نەرویجی نوێ) بە دوو شێوازی یەك زمان دادەندرێت.

لە ئەفریقا وئەمەریکای خواروودا، هێشتا زۆر زمانی بچووك و دابڕاو هەن کە باش لێیان نەکۆڵدراوەتەوە. لە شوێنی ئاوادا بواری ئەوە ماوە دیاردەی گەشە و سەرهەڵدان و نەمان و. . . زمانی تازە لێی بکۆڵدرێتەوە.

زمان لەگەڵ گۆڕانی هەلومەرجەکانی ژیانی خەڵکدا، دەگۆڕێ وگەشە دەکات.

لە دنیای مۆدێرندا پێشکەوتنی زۆر خێرای زانست و تێکنۆلۆجیاش، پێوستی بەردەوامی بە وشەی تازە و نوێ هەیە.

زۆر جار دەوڵەمەندی و هەژاریی زمانێك بە ژمارەی ئەو وشانە لێكدەدرێتەوە كە لەو زمانەدا هەیە. بەڵام ئایا دەكرێ ژمارەی وشەكانی زمانێك بزاندرێت؟

ژماردنی ژمارەی وشەكانی زمانێك شتێكی بێ واتا دەبێت ئەگەر پێشتر بڕیار نەدرابێت بە چ شێوەیەك (وشە) دەژمێردرێن. ئایا ئامرازەكانی پەیوەندی وشەن؟ ئایا پێشگر و پاشگر سەربەخۆ دەژمێردرێت یان نا؟ وشە لێكدراوەكان یەك وشەن یان پتر و. . . تا دوایی. . . شێوازی جیا بەرەنجامی یەكجار جیاواز بەدەستەوە دەدەن؟ ئەگەر شێوازێكی دیاریكراویش ڕەچاو بكەین بۆ ژماردنی وشەكانی زمانێك دیسان بەرەنجامەكەی نەختێ لە ڕاستی نزیك دەكەوێتەوە.

هەر بۆ بەراوردكاری ئێمە چەند ژمارەیەك دەخەینە بەرچاو كە بە ڕەچاو كردنی هەمان شێواز لە چەندان زماندا بە دەست هاتوون، لە هەموو ئەو زمانانەدا ئەو وشانەی ناو ڕستە ژمێردراون كە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەكاردەبرێن، خۆ لە ژماردنی وشەی ناوازە و هەڵاوردە، یان وشەی كەم بەكارهاتووی زانستی و تەكنیكی پارێزراوە.

- نزیكەی ٠٠٠/ ٥٠٠ وشە لە ئینگلیزیدا هەیە.
- نزیكەی ٠٠٠/ ٣٠٠ —٠٠٠/ ٢٠٠وشە لە ئەڵمانی یان سویدی و زمانە جێرمانییەكانیتر هەیە
- نزیكەی ٠٠٠/ ٢٠٠ وشە لە فرەنسی، ئیتاڵی، ئیسپانی و سەرجەم زمانە ڕۆمانییەكانیتر هەیە.

زمانی ئینگلیزی عەمبارێكی گەورەتری وشەی لەچاو زمانەكانیتر هەیە. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە لەسەدەی دەیەمی زاینیدا نۆرماندیەكان دوورگەكانی بریتانیان گرت و كاریگەری قوڵیان بەسەر زمانی ئینگلیزیەوە جێهێشت بە جۆرێك كە عەمباری وشەی ئینگلیزی كە لە بنەڕەتدا جێرمانییە، لە عەمباری زمانە ڕۆمانییەكانیشی هەڵهێنجاوە جگە لەوەش زمانی ئینگلیزی وەك دەزانین لە پێشنەگی ئەو زمانانەدایە كە وشەی زانستی و تەكنیكی نوێ دێنێتە ئاراوە، زۆر تێرمی تازەی زانستی یەكەمجار لە زمانی ئینگلیزیدا جێپێی خۆی دەكاتەوە. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت كە ئینگلیزی زمانێك عەمباری وشەی لە كەسێكی تر زۆرترە كە بە ئینگلیزی نادوێ جێگای سەرسوورمانە كە زمانی فرەنسی عەمباری و شەكانی تەنانەت لە زمانی سویدیش كەمترە. یەكێ لە هۆ گرنگەكان ئەوەیە كە زمانە جێرمانییەكان زۆر بە ئاسانی توانای پێكهێنانی

رادەیەکی زۆر وشەی لێکدراویان هەیە. هەروەها زمانزانە فرەنسییەکان لە شەڕێکی هەمیشەییدان بۆ ئەوەی زمانەکەیان لە زاراوە و وشەی سەر جادە بپارێزن.

لەوانەیە بوێرین بڵێین کە وشەکانی زمانێکی بەڕاستی، زمانێك کە مرۆڤ بەڕاستی بە زمانی رۆژانەی خۆی دەزانی و قسەی پێدەکات، خۆی لە ۵۰ /۰۰۰ وشە دەدات. دیارە هەروا ئاسانیش نییە ئەو وشە نەناسراوانە بژمێرین کە ئاخێوەرانی زمانێك لە زمانی رۆژانەیاندا بەکاری دێنن. ئەوانەی بە زمانێك دەدوێن کە زمانی زکماکی خۆیانە، راهاتوون کە لە زۆربەی وشەکانی زمانی خۆیان بگەن و بەکاری بێنن.

ئەو کەسانەی کە ئاستی خوێندەواریان بەرزە، ئاستی عەمباری وشەی چالاکیان پتر لە ۲۰۰۰۰ وشەیە. ئەو فرەنسی و ئینگلیزی زمانانەی کە عەمباری وشەی چالاکیان لە ۲۰ /۰۰۰وشە زۆرترە کە مەن. ئەو کەسانەش کە نیوەی ئەو ژمارەیە وشەیان لە عەمباری مێشکدا هەیە هەر بە ئاخێوەرێکی چالاك دەژمێردرێن. نابێ لە بیری بکەین کە هەموو تاکە کەسێك عەمباری ناچالاکی و شەشی لە مێشکدا مۆڵداوە (وشەی ناچالاك ئەو وشانەن کە تاك بەکاریان ناهێنێت، بەڵام بە گوێلێبوون یان خوێندنەوە لێیان تێدەگات) ژمارەی وشەی ناچالاك لای تاکێك بە دوو ئەوەندەی ژمارەی ئەو وشانە دەخەملێندرێ کە ئەو تاکە چالاکانە بەکاریان دێنێ.

## ئایا گەورەترین زمان ئینگلیزییە یان چینی؟

پتر لە ملیارێك مرۆڤ یان هەر یەکێك لە پێنج کەسی سەر گۆی زەوی زمانی زکماکی چینییە. ئەو ژمارەیە، چینییەکانی ناو وڵاتی چین و دەرەوەی چین دەگرێتەوە. بەڵام زمانی چینی (وەك دواتر باسی دەکەین) شەش شێواز، یان شێوەزاری لێك جیاوازی هەیە. هەرچی دەربارەی زمانی ئینگلیزیە ئەوا کارێکی زۆر سەختە بزانین چەند کەس بە ئینگلیزی دەدوێن. ئێستا ئەوانەی زمانی زگماکیان ئینگلیزیە لە سەروی ۳۵۰ ملیۆن کەس دەبن. بێگومان ژمارەی ئەوانەی کە ئینگلیزی وەکو زمانی دووەم بەکاردێنن زۆر زۆرترە لە ئینگلیزی زمانانی زگماك. ئەی ئەوانەی کە سەریان لە ئینگلیزی دەردەچێ و لەکاتی پێویستدا بەکاری دێنن چەندن؟ بێگومان زانینی ئەم ژمارەیە کارێکی ئەستەمە.

ملیاردێك و نیو خەڵك لەو وڵاتانە دەژین كە زمانی ئینگلیزی بە تەنیا یان لە پاڵ زمانی تر، زمانی دیوانی(رەسمی)ی خوێندن و فێربوون و قسەكردنە. بەڵام زۆر لە خەڵكی ئەو وڵاتانە لە راستیدا یەك وشەی ئینگلیزیش نازانن. بۆ نموونە تەنیا سێ لە سەدی خەڵكی هندستان بە راستی دەتوانن لە زمانی ئینگلیزی بگەن. كەواتە بێ هیچ گومانێك چینی لە لایەن زۆرترین مرۆڤی سەر زەوی قسەی پێدەكرێت. بەڵام زمانی ئینگلیزی وەكو زمانێكی نێو نەتەوەیی بێ ركابەری لە لوتكەیە. زمانی ئینگلیزی رۆژ بە رۆژ بایەخی پتر دەبێت وەك زمانی لینگوا فرانكا lingua fronca (زمانی لێكگەیشتنی گشتی) لەناو و لە نێوان نەتەواندا.

## دە زمانی هەرەگەورەی دنیا

(بە گوێرەی ئەوەی چەند ملیۆن كەس بە هەریەك لەو زمانانە دەدوێت )

چینی: ١٠١٠٠

ئینگلیزی: ٣٦٠

ئیسپانی: ٢٨٠

هیندی: ٢٥٠ (تێبینی: زمانی ئۆردوش لە پاكستان هەرشێوازێكی هیندیە بەڵام نەخراوەتە سەر ئەم ژمارەیە)

عەرەبی: ١٦٠

بەنگالی: ١٦٠

رووسی: ١٥٠ ( ئەو ملیۆنان كەسە رەچاونەكراون كە لە وڵاتانی یەكیەتی سۆڤیەتی پێشو زمانی رۆژانەیان بۆتە رووس)

پورتوگالی: ١٦٠

ژاپۆنی: ١٢٥

ئەڵمانی: ١١٠

پەنجابی: ٨٠

فرەنسی: ٨٠

جاوەیی: ٨٠

بەشێك لە زمانە گەورەو گرنگەكان چیرۆكی تایبەت بە خۆیان هەیە لە رووی بڵاوبوونەوە و بەرفراوانبوونیانەوە لە سەردەمێكی مێژوویدا.

**زمانی چینی:** زمانێکی کولتووریی کۆنینەیە. تا هەزارەی یەکەمی زایینی ئەو زمانە تەنیا لە کەنارەکانی روباری زەرد قسەی پێدەکرا. لەدوای ئەمەوە وڵاتی چین پەلی بەهەر چوارلایدا هاویشت و بەرفراوان بۆو. زۆر لە پەلاماردەرانی چین، کە پتریان گەلە رەوەندەکانی باکوور و ناوەڕاستی ئاسیا بوون. بە تێپەربوونی کات توانەوە و بوون بە چینی و کەوتنە بەکارهێنانی زمانی چینیش.

زمانی تریش هەن لەخواروو خوارووی رۆژهەڵاتی ئاسیا کە توند بە شارستانییەتی کۆنینەوە گرێدراون وەك (هیندی- نۆردوو)، بەنگالی، تامیلی و جاوەیی بەڵام لە کۆنیا بە چینی ناگەن. ئاسینەوەیەکی گرنگی ئەو زمانانە بە چینیشەوە ئەوەیە کە نەیانتوانیوە لە دەرەوەی سنووری جیۆگرافی خۆیاندا پەرەبستێنن. هەندێ دەستەی کەمی ئەتنی پەنابەرانی ئەو زمانانە هەن کە تا ئێستاش دەستیان بەداب و نەریت و ئاین و زمانی کۆنینەی خۆیانەوە گرتووە بێئەوەی توانیبێتیان لەدەوروبەر بڵاوی بکەنەوە.

**زمانی عەرەبی:** ، زمانی ئاینی ئیسلامە، لە کۆتایی سەدەی شەشەم و سەدەی حەوتەمی زاینیدا ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە رۆژئاوای نیوەدورگەی عەرەبیەوە بەرەو باکوور، رۆژئاوا و رۆژهەڵات بڵابووەوە. ئەو زمانە بە زوویی تەنگی بەو زمانانە هەڵچنی کە لە خوارووی میسۆپۆتامیا، دەشتی شام ومیسر باوبوون. زمانی عەرەبی بەهۆی ئەوەی کە زمانی قورئانە و زمانی رێورەسمە ئاینییەکانی خەڵکێکی زۆرە، کاریگەری بەردەوامی بەسەر خەڵکانێکی زۆرەوە هەیە کە ئەو زمانە زمانی زگماکیان نییە. زمانەکە لە دوای روخانی دەوڵەتی ئەمەویەوە(٧٥٠) زاینی چیتر نەیتوانیوە ناوچەی ترو پانتایی و رووبەری تر بخاتە سەر خۆی.

لە سەرەتای سەدەی بیستەوە هەوڵی رێکخراو بەردەوام هەبووە بۆ ئەوەی عەرەبی بکرێت بە زمانی زگماکی ئەو گەل و نەتەوانەی کە بەهۆی سنوور راکێشانەوە کەوتونەتە ناو سنووری ئەو وڵاتانەی کە بە جیهانی عەرەب ناسراون. نموونەی ئەو زمانانەی کە کەوتونەتە بەر هەرەشەی زمانی عەرەبی بریتین لە: کوردی، سریانی، قیبتی، نۆبی، تەواریقی، ئەمازیغی و هتد. . .

**زمانی کۆلۆنی ئەوروپی:** دیاردەیەکی تەنیا تەمەن ٣٠٠-٤٠٠ ساڵەیە. دامەزران و نیشتەجێبوونی ئەوروپیان لە وێستگەی کۆلۆنی خاکێکی بیانیدا لەسەدەی پازدەیەمەوە دەستی پێکرد. لەسەدەی هەژدەیەم گەیشتە چڵەپۆپەی پەرەسەندن.

١٣٤٥٠

ئەمە هاوکات بوو لەگەڵ گەشەی پیشەسازی و گەڕان بەدوای بازاڕی تازەدا. زمانی کۆلۆنی لەو ناوچانەدا باش چەسپا کە خەڵکێکی زۆری وڵاتە ئەورووپیەکە رویان تێدەکرد و تێدایدا نیشتەجێ دەبوون. لە دورگەکانی بریتانیاوە رووەو: وڵاتە یەگکرتوەکانی ئەمەریکا، کەنەدا، ئوسترالیا و زلاندی نوێ. لە فرەنساوە رووە و: کەنەدا. لە ئیسپانیاوە رووەو: ناوەڕاست وخوارووی ئەمەریکا. لە پورتوگالەوە رووەو: بەرازیل و تادوایی. . . .

زۆرجار رویداوە کە جۆرە جیاوازیەك لە نێوان ئەسڵی زمانەکەو ئەو زمانە لە وڵاتی کۆلۆنیدا دروست ببێ. جیاوازی نێوان ئینگلیزی ئەمەریکا و" ئینگلیزی وڵاتی بنەڕەت (بریتانیا) نموونەیەکی لەو چەشنەیەو زۆر ناسراوە.

لە سەردەمی نوێدا کۆچ وەك دیاردەیەك رۆڵی بینیوە لە بڵاوبوونەوە یان پەرتبوونی فراوانتری ئیسپانی زماندا. زۆر لە ئیسپانیا زمانانی خوارووی ئەمەریکا. بە تایبەت مەکسیك، کوبا و پۆرتۆریکۆ لەم چەند دەساڵەی دواییدا رویان لەوڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کردووە. ئێستا پتر لە دە لەسەدی خەڵکی ئەمریکا زمانی زگماکیان ئیسپانییە. ئەم رێژەیە بەردەوام لە هەڵچوونیشدایە.

دوو زمانە گەورەکەی تری ئەوروپا، ئەڵمانی و ئیتالی بەشێوەی سێ زمانەکەی تر لە دەرەوەی ئەوروپا بڵاونەبوونەتەوە. یەکێ لە هۆکان ئەمەیە کە ئەم دوو وڵاتە درەنگ فریای کۆلۆنی کردنی خاکی تر کەوتن، بەمەش بواری دانانی نشینگە و بڵاوبوونەوەی زمانیان، بۆ هەڵنەکەوت.

هەلومەرجی زمانی رووسی نەختێ جیاوازە. رووسەکان هەموو توانای کۆلۆنی کردنی خۆیان لە دوو ئاراستەدا خرکرِدەوە. یەکەمیان پرکردنەوەی خاکێکی گەورەی بەتاڵ لەبەشی رۆژهەڵاتی ئاسیا (سێبیریا) کە تا سەدەی هەژدەیەم تەنیا چەند میللەتێکی رەوەند و راوچی بچووکی تێدا دەژیا. دووەمیشیان داگیرکردن وکۆلۆنی کردنی وڵاتانی هاوسێی خۆیان لە باشوور و رۆژئاوادا.

لە سەردەمی یەکیەتیی سۆڤیەتدا (١٩١٧-١٩٩١) رووسەکان لەژێر پەردەی ئایدیۆلۆجیایەکی جیادا درێژەیان بەهەمان رەوتدا. زمانی رووسی زمانی دیوانی هەموو ئیمپراتۆریاکە بوو. هاوکات شان بەشانی چەندان زمانی جۆراوجۆر، کرابوو بە زمانی خوێندنی هەموو خەڵکی ئیمپراتۆریاکە. لەدوای جەنگی دووەمی جیهانیشەوە، وەکو زمانی خوێندن بەسەر خەڵکی چەندان وڵاتی رۆژهەڵاتی ئەوروپا داسەپێندرابوو، کە

رژێمەکانیان لە رکێفی رژێمی یەکیەتی سۆڤیەت دەسوورانەوە. دوای داتەپینی یەکیەتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩١ زمانی رووسی لە ولاَتانی پێشوی یەکیەتیی سۆڤیەتدا تا رادەیەکی زۆر پێگەی خۆی پاراستوە. لەلایەکەوە کۆلۆنی رووسی زمان لە هەموو ئەو ولاَتانە ماون، لەلاکەی تریشەوە هیچ یەك لەو ولاَتانە بەو ئەندازەیە توانای دارایی نییە تا سیستەمی خوێندن و زمانی خوێندن بە قازانجی زمانی زگماك بگۆرێت.

کەچی پێگەی زمانی رووسی لە ئەوروپای رۆژهەلاَت وەك تارمایی لەسەر سەری خەلَك رەویەوە و شوێنەواری نەما. تەنیا لە بولگاریا نەبێت کە بەهۆی نزیکی هەردوو زمان، فێربوونی رووسی شوێنەوارێکی لیَ بەجێماوە.

زمان لە ولاَتانی تازە پێشکەوتودا سەرەنجامێکی تری هەبوو. بەشێکی زۆری ولاَتانی ئاسیا لە قۆناغیَ کۆلۆنیالیزمدا جۆرێك لە خۆبەرێوەبردنیان هەبووە. زۆریان توانیشیان زمانی زگماکیان بپارێزن و پەرەی پێبدەن وەك: ئێران، ئەفغانستان، چین، تایلاند، نیپال، بۆتان و هیتر. ولاَتانی جیهانی عەرەب سیستەمی نوێی خوێندنیان لە کۆلۆنیالیزم وەرگرت بەلاَم ئەم سیستەمە پێگەی زمانی قورئانی لەق نەکرد. لەوانەیە ولاَتانی باکووری رۆژئاوای ئەفریقا، تونس، جەزائیر و مەغریب ناوازەبن کە زمانی فرەنسی وەکو زمانی رۆشنبیری و نووسین تا ئێستاش پایەی بەهێزە.

لە بەشەکانی تری ئەفریقا بارودۆخەکە بە شێوەیەکی ترە. دەسەلاَتی کۆلۆنیالیزم گوێیان بەگەل و میللەت و نەتەوە و زمان نەدا کاتیَ کە خاکیان لە نێوان خۆیان دابەشیەوە. هەربۆیەشە کە هێلە سنووریەکانی ئەمرۆ بە چەپ و راستدا نەتەوەو زمانی لە نێوان چەندان دەولَەتدا لەت و پەت کردووە. لە نایجیریا پتر لە ٣٠٠ زمان قسەی پێدەکریَ و لە کۆنگۆ (کینشاسا) پتر لە ١٥٠ زمانی قسەکردن هەیە. لە تەنزانیا ژمارەی زمانەکان لە سەرووی ١٠٠ دایە. لە کینیا ٤٠ نەتەوەو پتر لەوە زمان هەن. . . هتد.

لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا لەهەر ولاَتێك ژمارەیەك رۆشنبیر و ئێلیت بە کولتوور و زمانی کۆلۆنیالیست راهاتبوون. ئەو ژمارە خەلَکە کەمی هاوکاربوون لە راپەراندنی کاروباری دامەزراوەکاندا. دوای رزگاربوون و سەربەخۆییش لە سالاَنی شەستی سەدەی رابردوودا. ئێلیتی تازە دەسەلاَت وەرگرتوو، زمانی ولاَتی کۆلۆنیستیان وەك زمانی دیوانی(رەسمی) لەو ولاَتانە پاراستووە.

بە هەڵبژاردنی زمانێکی بێلایەن و بێخاوەن لەنێو سەدان زمانی ناو سنووری دەوڵەتدا، دەسەڵاتداران خۆیان لە کێشەیەکی هەمیشە لەسەر پێ دەرباز کردووە.

لە زۆربەی وڵاتانی خوارو و ناوەڕاستی ئەمەریکادا، زمانی ئیسپانی ماوەیەکە بۆتە زمانی رۆژانەی بەشی هەرە زۆری خەڵك. پاراگوای تاکە وڵاتێکی ناوازەیە کە هێشتا زۆرینەی خێڵە ئیندیانەکان (هیندە سوورەکان) زمانی گورانی بەکاردێنن.

لە بەرازیلیشدا، زمانی پورتوگالی زمانی رۆژانەی هەرە زۆری خەلکە. سەرەڕای ئەوەش هێشتا ئیندیانەکان ١٥٠ زمانی تر لەو وڵاتە بەکاردێنن. کەچی هەر زمانێك تەنیا چەند هەزار ئاخێوەرێکی هەیە.

وەك دەزانین زمان پێویستیەك بووە کە مرۆڤ لە پرۆسەیەکی شارستانییەتی ئالۆز و دوور و درێژدا دایهێناوە. خودی زمان بە گۆڕانی هەلومەرجەکان، شێوازی ژیان و گوزەران، کۆچ و شەر و پەلامار و داگیرکاری، بازرگانی و پەیوەندی و هاموشۆ زۆر هۆکاری تر هەمیشە گۆڕانی بەسەردا هاتووە. پرۆسەی گۆڕانی زمان لەم سەد ساڵەی دوایدا زۆرخێراتر بووە بەهۆی کارتێکردنی بەردەوامی دامودەزگای جۆراوجۆری راگەیاندنەوە. لەم سەردەمەدا تەلەفزیۆن، کۆمپیوتەر و رادیۆ و رۆژنامە جڵەوی پرۆسەی گەشەکردنی زمانیان لەدەست گرتووە.

کاتێ کە مرۆڤایەتی یان کۆمەڵگای پەرت و بڵاوی مرۆڤ بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیەکانی خۆی پێویستی بە دانووستان هەبووە، زمانی خۆی گەشە پێداوە تا وەڵامدەرەوەی ئەو پێویستیانە بێت. ئەو کاتە بیر لە دەستوور و رێزمان نەکراوەتەوە. هەزاران ساڵ درەنگتر، کەسانێك هاتوون و ویستویانە دەستوور بۆ زمان بنووسنەوە. بێگومان شتێکی ئاسایە کە پرۆسێسی زمان هەمووی ناترنجێتە ناو دەستوورەوە و لەهەر بڕگەیەکی دەستووری دا توشی کۆمەڵێك بابەتی ناوازە دەبینەوە. جاری وا هەیە چەند زمانێکی لێك نزیك هێشتا پتر نزیکی یەکتر دەبنەوە و چەند زاراوەیەکی زمانێك پێك دێنن. یاخود زمانێك بەسەر چەند زاراوەیەك دابەش دەبێت و لە دوارۆژدا زاراوەکان دەبن بە زمانی سەربەخۆ.

**با زمانی چینی وەکو نموونەیەك وەربگرین:**

زمانی چینی لە شەش شێوازی یان زاراوەی سەرەکی پێکدێت. چینی باکوور کە پتر لە حەفتا لەسەدی خەڵك پێی دەدوێن. و (wu) لە شانگهای ودەوروبەری بەکار دێت. مین (min) کە ئەویش دەبێ بەدوو زاراوە. لە فوجی و دوورگەی تایوان قسەی پێدەکرێت. هەروەها هەندێ لە چینییەکانی دەرەوەی چینیش پێی دەدوێن. کام هاکا (kam-hakka) پتر لە چیانگسی و باکووری گوانگ دۆنگ بەکاردێت، کسیانگ (xiang) لە هونان بەکاردێت. هەروەها ئییێ (yue) یان کانتۆنی کە لە خوارووی گوانگ دۆنگ و کانتۆن و هۆنگ کۆنگ و لای زۆربەی چینییەکانی دەرەوەی چین قسەی پێدەکرێت.

ئەم شەش زاراوانە ئەمەندە لە یەکتری جیان کە قسەکەرانیان لە یەکتری ناگەن، هەر بۆیەش بوونی شێوازێکی نووسینی وێنەیی هاوبەش، واتایەکی گەورەی بۆ هەموو زاراوەکان هەیە.

جگە لەمانە، زمانێکی سەرتانسەری یان ستانداردیش هەیە کە لەسەر بناغەی زاراوەی باکوور دروستکراوە و لە (پێیژینگ) یان پەکینی پایتەخت قسەی پێدەکرێت. بەو زمانە دەوترێت پۆتۆنگ هوە putong hua یان زمانی هاوبەش. لە تایوانیش شێوازێکی کۆنتری ئەو زمانە ستانداردە بەکاردێت کە پێی دەڵێن گۆیو guoyu یان زمانی نەتەوەیی. لە دەرەوەی چین تا ئێستاش شێوازێکی هەرەکۆنی ستاندارد بەکاردێت کە پێی دەوترێت ماندەرین mandarin واتا زمانی کارمەندان. ( وشەکە لە زمانی پورتوگالیەوە وەرگیراوە).

کاربەدەستانی چین هەوڵدەدەن تا هەموو هاووڵاتیانی چینی زمانی ستاندارد فێربن. ئەو منداڵانەی کە زمانی زکماکیان پوۆن هوەنییە، ئەو زمانە لە خوێندنگا وەکو زمانی دووەمی خوێندن فێر دەبن. بەرنامە سەرەکیەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆنیش هەر بەو زمانەیە ٥٠ ملیۆن چینی لە دەرەوەی چین دەژین. زۆربەیان یەکێ لە زارەوەکانی خوارووی چین وەکو زمانی رۆژانە بەکاردێنن. نزیکەی شەش لە سەدی دانیشتوانی چینیش زمانێکی تری جیا لە چینیان هەیە. نووسینی چینی تەمەنی لە چوارهەزار ساڵێك دەدات. زۆرجار دەگوترێ کە هەر وشەیەکی چینی نیشانەیەکی جیا بە خۆی هەیە. بەڵام راستترە گەر بڵێین هەر مۆرفیمێکی زمانی نووسین، نیشانەیەکی

جیاکەرەوەی خۆی هەیە. مەبەستمان لە مۆرفیم بچووکترین بەشی واتا بەخشی وشەیەکە. خوێندنەوەی وشەی چینی زۆر لە حونجەکردنی وشە دەچێت کە جاران لە حوجرە بۆ فێرکردن بەکار دەهات. لە زمانی چینیدا هەر مۆرفیمێك شێوە نووسین و دەنگی خۆی هەیە. لە بەیەکەوە لکاندنی مۆرفیمی جیا جیادا وشە پێکدێت. جاری واش هەیە یەك مۆرفیم بە ئەندازەی وشەیەك مانا بەخشە و دەبێ بە وشەیەکی سەربەخۆ. دەقێکی نووسراوی چینی بۆ هەموو ئەوانەی شێوەکان دەناسنەوە یەك واتا دەبەخشێ، بەڵام گەر کەسێك دەقەکە بەرز بخوێنێتەوە ئەوا تەنیا ئەوانە لێی تێدەگەن کە بەو زاراوەیە دەدوێن چونکە خوێنەرەکە هەر مۆرفیم/ وشەیەك بە زاراوە (زمان) ی خۆی دەخوێنێتەوە. زمانی چینی لە کۆندا لە سەرێ بۆ خوارێ دەنووسرا هەروەها لە راستیشەوە بۆ چەپ. ئێستا پتر لە چەپەوە بۆ راست دەنووسرێت بەڵام هێشتا هێما کۆنەکانی رێگاو بان لە راستەوە بۆ چەپ دەخوێندرێنەوە. هێشتا نزیکەی ٨٠٠٠ – ١٠٠٠٠ وێنە – وشە لەو زمانەدا هەیە. بەڵام بە لەبەرچاو گرتنی مێژوویی زمانەکە، هێما – وشەکان هێشتا پترن. ئەوانەی کە ٤٠٠٠ هێما- وشە پتر دەزانن زۆر دەگمەنن. ئەو ژمارەیە عەمبارێکی گەورەی وشەی چالاك دەگەیەنێ لە زمانەکانی تردا. ئەو کەسەی کە ٢٠٠٠ هێما – وشەی چینی دەناسێتەوە، دەتوانێ بێ هیچ کێشەیەك رۆژنامە بخوێنێتەوە. ١٥٠٠ هێما – وشە بەشی خوێندنەوەی دەقێکی نەختێ ئاسان دەکات.

هەوڵێك هەیە بۆ نووسینی چینی بە پیتە لاتینییەکان. لە ساڵی ١٩٧٩ ەوە زمانی ستاندارد بە پیتی لاتینی (پینین pinyin) دارژراوە و کەموو زۆر کاری پێدەکرێت.

## هۆکاری ئاسان بۆ لەیەکتر گەیشتن

هەر لە کۆنی کۆنەوە مرۆڤ هەوڵی داوە لە یەکتر گەیشتن ئاسان بکات تا بە ئاسانی کارەکانی بەرێوەبەرێت، بازرگانان، گەریدان، مژدەدەرانی ئاینی، نووسەران، نوێنەرانی پاشاو دەسەڵاتداران، سیخوران و پێشقەرەوڵانی لەشکر، قەڵەندەر ودەروێشان، کەسانی سەرهەڵگرتوو، راونراوان، کەتنکەران و. . . هتد رووبانکردۆتە دوورە وڵاتان و هەوڵیان داوە چ لە رێگاو چ لە پێگا بتوانن لە خەڵکەکە بگەن و تێشیان بگەیەنن. لە هەندێ قۆناغدا زمانی هاوبەشی گشتی lingua franca کەلێنێکی گەورەی لێکتر گەیشتنی

پڕکردۆتەوە. زمانی ئارامی بۆ ماوەی پتر لە ۱۰۰۰ ساڵ (۵۰۰پ. ز- تا ٦٥٠) زاینی رۆڵی لینگوا فرانکای بینیوە لە هەموو رۆژهەڵاتدا. دواتر زمانی عەرەبی ئەو کارەی کردووە. فارسییش نەختێ دواتر لە رۆژهەڵاتدا و لە ئاستێکی بەرتەسکتردا هەمان رۆڵ دەبینێ. ئەمڕۆش دەبینین کە زمانی ئینگلیزی لە جیهاندا بۆتە زمانی نێونەتەوەیی. زۆرجار کەسانێك بۆ رایی کردنی کاروباریان پێویستیان بە زمانێکی سادەتر لە لینگوا فرانکا هەیە. مرۆڤ ئەم پێویستیەشی پڕکردۆتەوە بەداهێنانی ئەوەی کە پێی دەڵێن پیدگین *pidgin (زمانی تێکەڵ و پێکەڵ). پیدگین شێوەیەکی سادەی زمانی یارمەتیدانە. دەکرێ ئەو زمانە تێکەڵێك بێت لە دوو یان پتر لە زمانان، یاخود شێوەیەکی سادەکراوەی زمانێك بێت. زۆرجار پیدگین لە زمانە گەورەو بەربڵاوەکان دروست دەکرێت وەك ئینگلیزی، ئیسپانی، فرەنسی و پورتوگالی، بەڵام دەکرێ لە زمانی تریش پێك بهێندرێت. بنچینەی پیدگین بریتیە لە شێوەیەکی زۆر سادەی زمان بە کەمترین وشەو سادەترین دەستوور. پیدگین بەخێرایی و بۆ بەئەنجام گەیاندنی کارێکی کەم تەمەن بەکاردێت، هەر بۆیەشە زمانی لەم جۆرە تەمەن کورتە. جاران واباوبوو بازرگانان بۆ ئاڵ وگۆر و سات و سەودا، زمانی سادەی وایان بەکاردێنا. بازرگانانی چینی سەدەی ۱۹ بە پیدگین لەگەڵ بازرگانانی بریتانی دەدوان چونکە لایان وابوو فێربوونی زمانی شەیتان سوکایەتیان بەسەردێنێ.

### *زمانی کریۆلی (زمانی هاوبەش):

زمانی پیدگین لە لایەن چەند کەسێکەوە دادەڕێژرێ بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەك لە ماوەیەکی کورتی دیاری کراودا. کاتێ کە زمانەکە دەکەوێتە ناو خەڵك، ئیدی ئەوانن کە چارەنووسەکەی دیاری دەکەن. هەر تاکێك بەئەندازەی ئاستی رۆشنبیری وخوێندەواری خۆی، بەئەندازەی پڕکردنەوەی پێویستیەکانی، کار لە زمانەکە دەکات. کاریگەری هەرتاکێك هاو ئاراستە لەگەڵ تاکەکانی دی، ئەو زمانە بەرەو ئامانجێك لێدەخوڕن. جاری وابووە کە کۆمەڵە خەڵکێکی زمان جۆراوجۆر، پێویستیان بەوە هەبووە بەخێرایی زمانێکی هاوبەشی لە یەکتر گەیشتن دابهێنن. باشترین نموونە ئەو کۆیلە ئەفریقییانەن کە لە سەدەکانی ۱۷ و ۱۸ بۆ سەرو وخوارووی ئەمەریکا راگوێزران تا لە کێڵگە بەیارەکاندا کاریان پێبکەن. کۆمەڵگای جیاجیای کۆیلان، بەسوودوەرگرتن لە زمانی

خاوەنەکانیان، یەکەمین زمانی کریۆلیان بۆخۆیان پێکهێنا. زۆر لەو زمانە تازانە کریۆل ئینگلیزی یان کریۆل فرەنسین، بناغەی زمانی کریۆلی، هەر لە بناغەکانی پیدگین دەچێت، بە جیاوازی ئەوەی کە کریۆل دەبێ هەموو مەرجە پێویستیەکانی زمانێکی زگماك پربکاتەوە. واتا دەبێ لە گەشەکردنێکی بەردەوامدا بێت. تا ئێستا پتر لە سەد زمانی کریۆلی لەسەر گۆی زەوی هەیە. هەندێ لەو زمانانە بە دیوانی وەکو زمانێکی سەربەخۆ لە لایەن کاربەدەستانەوە دانیان پێدانراوە، بۆ نموونە لە دورگەکانی سێیشێل جۆرێك لە کریۆل فرەنسی زمانی دیوانی وڵاتەکەیە کریۆل فرەنسی لە وڵاتی هایتی بۆتە زمانی نەتەوەیی وڵاتەکە و پێی دەوترێ زمانی هایتی. زۆرینەی خەڵکی هایتی لە زمانی فرەنسی ناگەن بۆیە زمانی هایتی زمانی حاوبەش و نەتەوەیی خەڵکەکەیە. دوورگەکانی ڤانواتو لە دەریا لوشی ئارام بە بیسلاما دەدوێن کە لەسەر بناغەی ئینگلیزی بنیات نراوە.

کاتێ ئینگلیزی زمانەکان چوونە ناو نیوە دوورگەی پاپوا گینیای نوێ، زمانێکی پیدگینیان دانا بۆ لە یەکتر گەیشتن لەگەڵ خەڵکەکەی. کە خەڵکی بومی دەهاتنە لای ئینگلیزەکان و قسەیان دەکرد، ئەوان بە ئینگلیزی داوایان لێدەکردن talk pidgin! یان بە پیدگینی بدوێ! خەڵکەکەش دەیانگوت تۆك پیسین tok pisin. پیدگینی (تۆك پیسین) سەرەتا لە ٧٠٠ وشەی سادە پێکهاتبوو. ئێستا زمانی دیوانی خەڵکە و پتر لە ١٠٠ /٠٠٠ وشەی هەیە.

تا سەردەمی شەڕی خاچپەرستان لە هەزارەی یەکەمی زاینیدا، خەڵکی دوورگەی ماڵتا بە شێوە زارێکی عەرەبی دەدوان. بە هۆی نیشتەجێبوونی شەڕکەرانی ئەوروپی لەو دورگەیەدا، زمانی عەرەبی لە دەوروبەرەکەی خۆی دابڕاو بوو بە زمانی کریۆلی ماڵتایی کە بە پیتی لاتینی دەنووسرێ.

ئەگەر زمانێکی کریۆلی هەلی بۆ برەخسێ، سنوورێکی بەرچاو بۆ گەشە سەندنی نییە. زمانی فرەنسی خۆی رۆژێك لە رۆژان شێوەیەکی کریۆلی زمانی لاتینی بوو.

## ئێسپێرانتۆ

لە دنیای مۆدێرندا، هەوڵی جۆراوجۆر دراوە بۆ دروستکردن و بڵاوکردنەوەی زمانی (دەستکرد)، ئەو بیرەی لە پشت ئەو هەوڵانەدا بوو، ئەوە بووکە زمانێکی لەم جۆرە

دەکرێ بکرێتە لینگوا فرانکێکی نێونەتەوەیی دیوانی، بە جۆرێك وەکو تەنیا زمانی هاوبەش لە ئۆرگانە جیهانییەکاندا بەکاربێت. ئێستا نەتەوە یەکگرتووەکان بەڵگەنامەکانی بە شەش زمانی دیوانی بڵاودەکاتەوە (ئینگلیزی، فرەنسی، ئیسپانی، رووسی، چینی، عەرەبی). زمانێکی دەستکرد دەکرێ بە شێوەیەك دروست بکرێت کە فێربوونی زۆر ئاسانتربێت لە زمانێکی بە سروشت بیانی.

کە چی وادەردەکەوێ کە بڵاوکردنەوە و چەسپاندنی زمانێکی لەم جۆرە سەختترە کە چاوەڕوانی لێدەکرێ زمانی دەستکردی ئێسپێرانتۆ کە لەساڵی ١٨٨٧ وە بە خەڵك راگەیاندراوە، لە هەموو زمانە دەستکردەکانی تر پتر بڵاو بۆتەوە. پتر لە نیو ملیۆن کەس لە سەر گۆی زەوی دەتوانن بە شێوەیەك لە شێوەکان بەم زمانەبدوێن،

## زمانی هێما- نیشانە

دەکرێ زمانێکی دەستکرد جگە لە دوان بە شێوازی تریش دەرببڕدرێت. بە یارمەتی هۆکاری جیاجیای وەك دووکەڵ کردنەوە، تیشك، ئاڵا بەکارهێنان و شێوازی تری لەیەك چوو، دەکرێ مرۆڤ سیستەمێکی هێمایی بەکاربێنێ کە پشت بە بینین ببەستێ. بەڵام هۆکاری تێگەیشتنی لەم جۆرە کە پشت بە بینین و سەیرکردن دەبەستێ، بە گشتی هەژارن یان بۆ شتی زۆر دەگمەن و تایبەت بەکاردێن، زمانی بە بینینی سروشتیش، بێگومان هەیە ئەویش زمانی هێمای کەڕو لاڵەکانە. زمانی کەڕو لاڵان لە سەردەمی مێژوویی جیاجیادا و لە وڵاتانی جۆراو جۆر، بە شێوەیەکی سروشتی گەشەی کردووە، بۆ رێکخستنی پەیوەندی نێوان کەڕو لاڵان لەگەڵ یەکتری و لەگەڵ خەڵکی دەور و بەریشدا. لەبەر ئەوەی هەمیشەو لە هەرکوێیەك کەڕو لاڵ هەبوو بێت، هەوڵدراوە بە شێوەیەکی سروشتی بە زمانی هێما تێگەیشتنی لەگەڵ ئاسان بکرێت، هەر بۆیەشە هەوڵی زمانێکی هێمای نێو نەتەوەیی، نەیتوانیوە جێگای ئەو هەوڵە سروشتیە جیاجیایانە بگرێتەوە. بۆ کەڕو لاڵان، کە هەر لە منداڵیەوە فێردەبن هەندێ شت بە هێمای تایبەتی دەربڕن، زمانی هێما، وەك زمانی زگماکی لێدێت. زمانی هێماش وەکو زمانی قسەکردن، عەمباری وشەی خۆی هەیەو پەیرەوی لە دەستووری زمانیش دەکات. لە زمانی هێمادا هەموو پیتەکانیش بە یاریکردن بە دەست و پەنجە دەردەخرێن. بۆ نموونە بۆ دەربرینی ناوێك دەکرێ پیت بە پیت ناوەکە حونجە بکرێت. هەموو ئەوشتانەی کە بە

زمانی قسه دەردەبڕدرێت بە زمانی هێماش دەردەبڕێت، تەنیا ئەوەی جیای دەکاتەوە هۆکاری دەربرینەکەیە لەم جۆرە دەربڕینەدا، هۆکارەکە روی لە دیتن و چاوە نەك چاوو گوێ، هۆکاری چاو بوار بە زمانی هێما دەدات کە چەند شتێك لە یەك کاتدا دەربڕێت، کەچی لە زمانی قسەدا دەربڕینە واتا دەرەکان، دەبێ بەدوای یەکدا بێن.

## کێشەی نێوان زمانان

کێشەی زمانان زۆرجار رووەکەی تری کێشەی نەتەوایەتییە لە وڵاتێکی فرە نەتەوەدا. ئەم کێشەیە بە شێوەی تری جۆراو جۆریش، چ لەناو سنووری یەك دەوڵەتدا بێت، یاخود لە سەر ئاستی رێکخراوی ناوچەیی و نێو نەتەوەیی، سەر دەردێنێ. جاری وابووە زمان بۆتە قوربانیی ململانێی ئاینی. نموونەی لەم جۆرە لە هیندستان رووی دا. کەمایەتی موسوڵمانی هیندستان تا هاتنی ئینگلیزەکان بۆ ئەو وڵاتە، دەسەڵاتداری هەموو هیندستان بوون. دەسەڵاتدارانی موسوڵمان لە ئۆردووی سەربازیدا سەربازەکانیان فێری خوێندنەوە و نووسینی هیندی دەکرد، بێگومان بە پیتی عەرەبی. بەم جۆرە شێوە نووسینەی هیندیان دەگوت (ئۆردو) کە ئوردوگای سەربازی دەگەیەنێ. ناسیۆنالیستە هیندۆسەکان شێوە نووسینی کۆن و مێژوویی (سانسکریتی) یان زیندوکردەوە بۆ نووسینی زمانی هیندی. دوای سەربەخۆیی هندستان لە ساڵی ١٩٤٧زاینی، کەمایەتیی موسوڵمانی نەیانویست لەژێر چەپۆکی زۆرایەتیی هاو رەگەزەکانیان بژیننەوە و پاکستانیان دروست کرد، بەم جۆرە لەم ساڵەوە شێوە نووسینی ئوردو بوو بە زمانی ئوردو. هیندی زمانەکانی پاکستان لەو ٥٠ ساڵەی رابردودا بەردەوام هەوڵیان داوە وشە گەلێك لە فارسی و عەرەبی وەرگرن بۆ پتر دوورخستنەوەی ئوردو لە هیندی، هیندی زمانەکانیش هەمیشە زمانەکەیان بە وشە و تێرمی سانسکرێتی کۆن دەوڵەمەند دەکەن، بەمەش دووشێوە نووسینەکە رۆژ بە رۆژ پتر لێکتر دەترازێن، هەمان شت لە بالکان رویدا. سربەکان و بۆسنییەکان و کرواتیەکان هەموویان بەیەك زمانی هاوبەش دەدوێن، سربەکان ئورتۆدۆکس، بۆسنییەکان موسوڵمانن و کرواتەکانیش کاتۆلیکن، سربەکان بۆ نووسینی زمانی سربی، پیتی کیریلی رووسی بەکاردێنن، بۆسنییەکانیش هەمان زمان بە پیتی لاتینی دەنووسنەوە، وا خەریکن تێرمی (زمانی بۆسنی)ش بەکاردێنن.

کێشەی زمان و زاراوە لە زۆربەی ولاتە تازە پێگەیشتوەکان، وەکو بۆمبێکی کاتی دانراوە وایە، لەوانەیە هەرکاتێك بتەقێتەوە. کێشەی زمان لە جیهانی تازە پێگەیشتودا ئەمەندە ئاڵۆزە کە زۆر سەختە پێشبینی سەرەنجامەکانی بکرێت.

زمانی فرەنسی نموونەیەکی زیندوی قەیرانی نێونەتەوەیی زمانە، وەك پێشتر نووسیمان کە زمانی فرەنسی خۆی لە سەرەتاوە زاراوەیەکی زمانی کەونارای لاتینی بووە، ئەو زمانە بەرە بەرە گەشەی کردو بوو بە زمانی کریۆلی لاتینی. سەرەنجام وەکو زمانێکی سەربەخۆ تەکانی پێدرا، شۆرشی فرەنسی لە ١٤/ تەموزی ١٧٨٧ هەزاران شەیدای لە ئەوروپا بۆ فرەنسا و زمانەکەی پەیدا کرد. لە سەدەی هەژدەیەمی زاینیدا زمانی فرەنسی بووە زمانی بنەماڵە دەسەڵاتدارەکانی ئەوروپا. دواتر بوو بە زمانی دیپلوماسی. ئەوکاتە زمانەکە لە چڵەپۆپەی پەلوپۆدا بوو.

لە سەدەی نۆزدەیەمدا ئینگلیزەکان بە هۆی توانای هێزی دەریاییان بە هەموو لایەکی دنیادا بڵاوبوونەوە، ئەوان بۆ بڵاوکردنەوەی خێرای زمانەکەیان، رێك ئاوەژو بە پێچەوانەی فرەنسییەکان جوڵانەوە. لە جیاتی ئەوەی لەگەڵ دیپلۆمات و بنەماڵە دەسەڵاتدارەکان خەریك بن، راستەوخۆ چوونە ناو کۆمەڵانی خەڵکی وڵاتە کۆلۆنییەکان. بۆ ئاسانکاریش شێوازی پیدگینیان پیادەکرد. زۆری نەبرد زمانی ئینگلیزی جێگای بە فرەنسی لێژکرد، لە سەدەی بیست و یەکەمدا، زمانی ئینگلیزی بێ رکەبەری، بۆتە زمانی هاوبەشی نێونەتەوەیی لەسەر زەوی. زمانی فرەنسی لە ناو پێگەی سەختی خۆیشی کە فرەنسایە، کەوتۆتە بەر پەلاماری ئینگلیزی، کە چی فرەنسییەکان هێشتا خەون بە سەدەی هەژدەیەمەوە دەبینن. بۆ ئەو مەبەستەش لە چەندان بەرە لە شەڕدان بۆ پاراستنی سەنگەرەکانی زمانی فرەنسی، لەسەر ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا فرەنسییەکان بۆ هەرکار و بڕیارێك ئامادەن ڤیتۆ بەکار بێنن ئەگەر زمانی فرەنسی وەك ئینگلیزی سەودای لەگەڵ نەکرێت، تەنانەت رێگا نادەن کەسێك ببێ بە سکرتێری نەتەوە یەکگرتوەکان گەر نەتوانێ بە فرەنسی بدوێت، حکومەتی فرەنسا رێکخراوێکی پان و بەرینی بەناوی (ولاتانی فرانکفۆنی) دامەزراندوە و پارەیەکی زۆر لەو ولاتانە خەرج دەکات کە رێگا دەدەن زمانی فرەنسی تێدا بخوێندرێت. ئەو رێکخراوەیە هەموو ئەو ولاتانەی لە خۆ گرتووە کە رۆژێ لە رۆژان کۆلۆنی فرەنسییەکان بوون، دامەزراوە

فەرەنسییەکان، لە قەیران و کێشەی زمانی دوو وڵاتدا خۆیان تێوە گلاندوە کە جێی خۆیەتی لێرەدا باسیان بکەین.

**بەلجیکا:**

ئەوخاکە بچووکەی کە ئەمڕۆ دەوڵەتی بەلجیکای لەسەرە، سەرەتا دوو گەلی هاوسێی خاوەن دوو زمانی جیا، بەڵام هاو مەزهەبی تێدا دەژیا. فلامانەکان (فلاندەرەکان) کە بەزاراوەیەکی باشووری هۆڵەندی دەدوێن لە باکوور و، ڤالۆنەکانیش کە ژمارەیان کەمترە لە خوارو بە زاراوەیەکی فەرەنسی دەدوێن. لە سەدەکانی رابردو، کاتێ کە گەلانی باکووری ئەورووپا مەزهەبیان لە کاتۆلیکەوە بۆ پرۆتیستانت گۆڕی، شەڕی ئاینی لە نێوان دوو مەزهەبەکە هەڵگیرسا. فلامانە هۆڵەندیەکان پرۆتیستانتتیان وەرنەگرت بە پێچەوانەی زۆرینەی هاوزمانەکانیان لە هۆڵەندە. ڤالۆنەکانی هاوسێی باشووریان کە کاتۆلیک بوون کەوتنە پشتگیری فلامانەکان. دوای چەندان ئالوگۆڕی بەسەر ناوچەکەدا، لە کۆتایدا ئەورووپییەکان لە ساڵی ١٨٣٠زایینی پەژیراندیان کە بەلجیکا سەربەخۆ بێت. ئەو سەردەمە زمانی فەرەنسی لە چڵەپۆپە بوو. هەموو ئەورووپییەك خەونی بەوە دەدیت بەو زمانەی چینی سەرەوە بدوێت. ئەمە وای کرد بێ هیچ گرفتێك زمانی فەرەنسی ببێ بە زمانی دیوانی بەلجیك، سەرەڕای ئەوەش کە فلامانەکان زۆرینە بوون. برۆکسلی پایتەخت دەکەوێتە ناو خاکی فلامانەکان، بەڵام چونکە ناوەندی دەسەڵات و ئۆرگانەکان بوو، ژمارەیەکی زۆر ڤالۆن لە برۆکسل نیشتەجێبوون. زۆر لە فلامانەکانیش لە پرۆسەیەکی دوور و درێژدا زمانیان بووە فەرەنسی، بەم جۆرە کاتێك بینرا کە زۆرینەی خەڵکی برۆکسل فەرەنسی زمانن. لە گەرمەی شەری یەکەمی جیهاندا، فلامانەکان کەوتنە داواکردنی یەکسانی زمان. ئەمە کاتێك بوو کە هاووڵاتیان مافی دەنگدانیان پێدرا. لە ساڵانی سی بە گۆڕینی دەستوور، هەردوو زمانی هۆڵەندی و فەرەنسی بە یەکسان داندران، هەروەها سەرجەم وڵاتەکە بەسەر شارەوانی تاك زمان دابەشکرا. هەر شارەوانەیەك بۆی هەبوو سنووری خۆی دەستکاری بکات، ئەگەر گۆڕان بەسەر زمانی ناوچەکانی دەووبەریدا هات. ئەو کات هێشتا زمانی فەرەنسی لای خەڵك پایەی بەرزتر بوو. زۆر لە فلامانەکان زمانی خۆیان دەگۆڕی و ناوچەکەیان دەخستە سەر شارەوانییە فەرەنسی زمانەکان. هاوکات بە هۆی دامەزراندنی

پیشەسازیی قورس لە کەنارەکانی دەریا، هەندێکیان دەوڵەمەند بوون و چینی ناوەند و دەوڵەمەندی فلامان کەوتنە بەرگری کردن لە زمانی خۆیان. لە ساڵانی شەستەوە دەستووریان گۆڕی و چیتر هەر شارەوانییەك بیەوێت ناتوانێت سنووری خۆی فراوانتر بکات. هاوکات شارەوانی برۆکسل بە شارێکی دوو زمانەی یەکسان داندرا لە کاتێکدا ٨٥٪ ی دانیشتوانی شارەکە بە فرەنسی دەدوێن. فرەنسییەکان کەوتنە دەربڕینی نارەزایی. کێشەی زمان تا دێت و ئاڵۆزتر دەبێت. هەموو جارێکیش بە گۆڕینی دەستوور و ئاڵۆزکردنی پرۆسەکە رووبەرووی کێشەکە دەبنەوە. بە گوێرەی دوا دەسکاریکردنی دەستوور دەبێت لە هەر حکومەتێکدا وەزیرانی فرەنسی زمان، ژمارەیان وەکو وەزیرانی هۆڵەندی زمان بێت. تا ئێستاش لە شارەوانییەکانی سەر سنووری نێوان هەردوو نەتەوە، کێشەی جۆراوجۆر دروست دەبێت. بێ باوەڕی لە نێوان هەردوو نەتەوە وایکرد کە لە ساڵانی حەفتاوە، هەموو پارتە سیاسیە گرنگەکان پشت لە ئایدیۆلۆجیا بکەن و ببن بە دوو بەش: پارتی هۆڵەندی زمان و پارتی فرەنسی زمان، هەموو دامودەزگاو دامەزراوە کۆمەڵایەتیەکانی وڵاتیش دۆڵێکی قوڵی زمان لێکیان جیا دەکاتەوە، بەرەنجامی ئەم پرۆسەیە بەوە گەیشتوە کە بەلجیکیای بچووك بۆتە وڵاتێکی فیدراڵی و دەسەڵاتی ناوەندیش تا دێ کزتر دەبێت. لە بەلجیکیای ئەمڕۆدا ٥٧٪ ی خەڵك فلامانیی هۆڵەندین. ٤٧٪ ڤالۆنی فرەنسین، کە نزیکەی ١٥٪یان لە برۆکسل دەژین، هەروەها ١٪ هاووڵاتیانیش زمانیان ئەڵمانییە.

**کەنەدا:**

فرەنسییەکان پێش ئینگلیزەکان کۆلۆنیان لە کەنەدای ئەمڕۆ دامەزراند. دواتر ئینگلیزەکان تێدایدا زاڵبوون. ئینگلیزەکان هەر لە ساڵی ١٧٧٤زاینیدا گەرەنتیان بە فرەنسی زمانانی کەنەدا دا کە زمانیان بە دیوانی دەمێنێتەوە و بۆیان هەیە لە فێرکردن و راپەراندنی کاری دەوڵەتیدا بەکاریبێنن. ئەمڕۆ لە ٦٠٪ی خەڵکی کەنەدا زمانیان ئینگلیزیە، فرەنسی زمانیش ٢٧٪ ی دانیشتوان پێکدێنن فرەنسییەکان زۆر بە توندی دەستیان بە زمانەکەیانەوە گرتووە و دەیپارێزن، بەڵام زمانی ئینگلیزی بە خێرایی بوو بە زمانی بازاڕ و ئابووری. بەهۆی ئەوەی کەنەدا هاوسێی وڵاتێکی بەهێزی وەك وڵاتە یەکگرتووەکانە، دەزگاکانی راگەیاندنی ئەمەریکا هاندەرێکی گەورەن بۆ پاڵپشتی کردنی

زمـانی ئینگلیـزی. کەنـەدا سـاڵانە پەنابـەر و کۆچـکردویەکی زۆر وەردەگـریّ، نزیکـەی هەموو ئەوانە زمـانی ئینگلیـزی هەڵدەبـژێرن بـۆ فێرکـردن. ئـەم پەرەسـەندنە، کەنەدیـە فرەنسییەکان دەترسێنیّ. ئێستا فرەنسی زمانەکان تەنیا لە کیوبیك زۆرینـەن، هـەوڵێکی رامیاری چڕ هەیە بۆ ئەوەی کیوبیك ببیّ بە دەوڵەتێکی سەربەخۆ. حکومەتی ناوەندی بـە گوێرەی دەستوور سەودای وەك یەك لەگەڵ هەردوو زمانی ئینگلیزی و فرەنسی دەکات. هەموو راگەیانـدنێکی دیـوانی(رەسمـی) بـە هـەردوو زمـان بـڵاو دەکرێتـەوە. ئەنـدامانی فرەنسی زمانی پەرلەمان، بە فرەنسـی دەدوێن. دادگای ناوەندی دوو زمانەیە و تـادوایی. کەچی هەموو ئەوانە دڵنیـایی بـە فرەنـسی زمانـان نابەخـشیّ. زمـانی ئینگلیـزی، بـەو فەرهەنگە جیهانییەی کە هەیەتی هەموو کەسێك بۆخۆی کێش دەکات، بۆیە ئەمڕۆ بـیّ یان سبەی فرەنسی پاشەکشە دەکات.

## زمانی پیرۆز. . . زمانی خودا

هەندیّ زمانی تا ئێستا زیندو و هەندێکیتری مردووش، وەکو نەریت بە ئاین و دەقی پیرۆزی ئاینییەوە بەستراونەتەوە. پەیوەندیەکی توند وتۆڵ و پتەو لە نێوان زمانی عیـبری و ئاینی جولەکەیدا هەیە. بە هەمان شێوەش زمانی عەرەبی، زمانی ئـاینی ئیـسلامە. ئاینی هیندۆسیش گرێدراوی دەقە پیرۆزەکانی زمانی سانسکرێتیە. هەندیّ ئاین هەن بـە هیچ زمانێکی پیرۆزەوە گریّ نەدراون لەوانە دەتوانین ئاینی بودایی ناو بەرین.

هەروەها پەیوەندی نێوان ئاینی مەسیحی و زمـانیش بـەو شـێوەیەی سـەرەوە نییـە. زمانێك نییە راستەوخۆ پەیوەندی لەگەڵ ئاینی مەسیحی دروسـت بکـات. بـەڵام هەنـدیّ مەزهەب و رێچکە و کڵێسا، لە رێی دەقی نزا و ئەنجامدانی ریّ و رەسمی ئـاینی، خۆیـان بە زمانێکی تایبەتی کڵێسایی گرێـداوە، هـەر وەك کڵێـسای رۆمـی کاتۆلیـك کـە ریّ و رەسمەکانی بە لاتینی ئەنجام دەدات.

ئەو زمانە ئاینییانەی کە ئەمڕۆ لای ئێمە ناسراون ئەمانەن:

**سانـسکرێت:** زمـانی پـیرۆزی ئـاینی هیندۆسـیە. دەقـەکانی سانـسکرێتی کـۆنترین دەقێکی زمانە هیندۆئەوروپییەکانە کەتا ئێستا پارێزراو بێـت. ئـەلفوبێی سانـسکریتی، کە پێی دەگوترێت (دەڤاناگاری) زۆر سیستێمی نوسینی لە خوارو رۆژهەڵاتی کیشوەری

ئاسیادا لێوەرگیراوە. سانسکرێتی بۆتە کوانویەکی بە پیت بۆ گەشە پێدانی زمانی هیندیی مۆدێرن.

**یۆنانی یان گریکی:** زمانی گریکی جگە لەوەی هەڵگری پەیامێکی شارستانی کۆنینەیە و زمانی زۆرێك لە فەیلەسوفانی پێش مێژووە، دیسان بە زمانی ئینجیل دادەنرێت، هەر بۆیەشە لە لایەن تیۆلۆجەکانی سەرجەم رێچکەو رێباز و کلێسا مەسیحیەکان، پێگەیەکی تایبەتی هەیە. هەر ۲۰۰ ساڵ پێش زاین تەورات (یان سەردەمی کۆن) بۆ زمانی گریکی وەرگێڕدراوە، کە ئەو کات زیندوترین زمانی سەر زەوی بوو. ئەو وەرگێڕاوەی تەورات (سیپتواجینتا septua ginta) وەکو ئینجیل یان سەردەمی نوێ وابوو بۆ مەسیحیە بەرایەکان، تا دواتر هەر بە گریکی سەردەمی نوێشی خرایە سەر.

**عیبری:** عیبری زمانی ئاینی جولەکەیە. زمانی عیبری چەند سەد ساڵێك پێش زاین کەوتە بەر گوشاری توندی زمانی ئارامی. سەردەمێك وای لێهات کە پێغەمبەرانی گەلی جولەکە پەیامە خودائیەکانی خۆیان بە ئارامی دەنووسییەوە، هەر بۆیە عیبری تەنیا لە چەند دەقێکی کۆنی تەورات و تەلمود پارێزراوبوون ئەو دەقە کۆنانە چیتر خەڵك تێیان نەدەگەیشتن. تەنیاحاخامەکان بە خوێندن فێردەکران و بۆ رێورەسمی ئاینی سوودیان لێ وەردەگرت.

جولەکەکانی رۆژهەڵات زمانی زگماکیان بۆ ئارامی گۆڕابوو. خودی عیسای مەسیح کە لە بنەماڵەیەکی ناسراوی جولەکە بوو لە ناسیرە، بە زمانی ئارامی دەدوا. جولەکەکانی ئەوروپاش بە زمانی یدیش دەدوان کە تێکەڵاوێك بوو لە ئەڵمانی و پۆڵۆنی. دوای هەوڵێکی زۆر زانایانی جولەکە دووبارە زمانی عیبریی مۆدێرنیان بە پشتبەستن بە عیبریی کۆن، زیندوو کردەوە. ئەو زمانە لە ساڵی ۱۹٤۸وە زمانی دیوانیی ئیسرائیلە. ئێستاش هەوڵ بەردەوامە تا زمانەکە لە دەقە عیبریەکانی تەورات نزیکتر بخرێتەوە.

**لاتینی:** زمانی لاتینی، زمانی بنەڕەتی هەموو زمانە رۆمانییەکانی ئەم سەردەمەیە وەك فرەنسی، ئیسپانی، ئیتاڵی، پورتوگالی و رۆمانی. کاتێ کە ئیمپراتۆریای رۆم

دوولەت بوو، لەتە رۆژهەڵاتەکەی یان بێزەنتە هەر لە سەر زمانی گرێکی مانەوە. لە رۆم، زمانەکە لەگەڵ پیتە لاتینییە لە یۆنانی وەرگرتووەکەی، هاوشانی یەکتر بڵاوبوونەوە و پەرەیان سەند. نزیکەی ساڵی ۲۰۰ی دوای زاین ئینجیل کرا بە لاتینی. لە کۆتایی ساڵی(۳۰۰ )ی زاینیدا ئینجیلی ڤولگاتە vulgata وەرگێڕدرایە سەر زمانی لاتینی. ئەو ئینجیلەی کە تا ئێستاش کڵێسای رۆمی کاتۆلیك پێڕەوی لێ دەکات. ئەو زمانە لاتینییەی کە ئەمڕۆ لە سێرمۆنییەکانی کڵێسا بەکار دێت شێوازێکە لە لاتینی سەدەکانی ناوەڕاست. زمانی لاتینی، بە ئینجیلە پیرۆزەکەیەوە، ببووە سیمبولێکی دەسەڵاتی رەهای کڵێسا و ڤاتیکان. مارتن لۆتەر لە ساڵی ۱۵۱۷ زاینی جڵەوی نارازیان (پرۆتیستانتت)ی گرت و لە دژی فێرکارییەکانی کڵێسا، ئینجیلی بۆ سەر زمانی ئەڵمانی وەرگێڕا. بە دەرکەوتنی کڵێسای پرۆتیستانتتی، زمانی لاتینی بەشێکی زۆری پێگە پیرۆزەکەی لە دەست دا و توشی پاشەکشە بوو، بە لەدەستدانی پاوانی ئینجیل تەنیا بە لاتینی، ئیدی ئەو زمانە لە دەمی مەرگ نزیك بووەوە. خودی زمانی لاتینی، ئەمڕۆ بۆتە گەورەترین سەرچاوە بۆ نزیکەی گشت زمانە ئەوروپییەکان.

**عەرەبی:** وەك دەزانین عەرەبی زمانی کتێبی پیرۆزی ئیسلام، قورئانە. بە گوێرەی لێکدانەوەی ئیسلام، وشەکانی ناو قورئان زمانی خودان و پیرۆزن، بۆیە هەر وەرگێڕانێکی قورئان تەنیا وەرگێڕانەو جێگای قورئان ناگرێتەوە. پیرۆزڕاگرتنی زمانی قورئان، هاندەرێکی بەهێز بوو بۆ بڵاوبوونەوەی زمانی عەرەبی لە رۆژئاوای ئاسیا و باکووری ئەفریقا. زمانی عەرەبی لە نێوان سەدەکانی حەوتەم و دوازدەیەمدا، لە چڵەپۆپەی گەشانەوەیدا بوو. بە پیرۆزبوونی زمانی عەرەبی، وەك شمشێرێکی دوو سەرەبوو. لە سەرێکەوە ببووە راگرتن و پاراستنی زمانەکە، کە لە لایەن هەزاران باوەڕداری عەرەبیزمان و گەلانی تر، خزمەتی دەکرا. کەچی ئەمڕۆ زمانە کلاسیکییەکە بۆتە رێگر لە رێگای داهێنانی بەرزدا. ئەو زمانە عەرەبییە مۆدێرنەی ئەمڕۆ، کە زۆر لە زمانی قورئان دەچێت، زمانی رۆژانەی هیچ گەل و تاقم و دەستە و کەسێك نییە، هەر وڵاتەو شێوەزاری لە عەرەبی وەرگیراوی خۆی هەیە. عەرەبی چیتر زمانی رۆژانەی کەس نییە، هەر بۆیەشە عەرەبی زمانان، لە زمان و داهێناندا هەژارن، زمانی عەرەبی ئەمڕۆ زۆر لە زمانی لاتینی دوێنێ دەچێت کە بۆ چەندان زمانی تر ورد بووەوە. زاراوە

جیاجیاکان، جگە لەوەی زمانی رۆژانەی خەڵکن لە زۆر بواری داهێنانیشدا برەویان پێدراوە وەك لە بوارەکانی هونەری گۆرانی، شانۆ و سینەما، کەچی پیرۆزی زمانە کلاسیکییەکە و شمشێری ئاین، وای کردووە هێشتا عەرەبەکان نەوێرن دەستبەرداری بن بە قازانجی زمانی رۆژانەی خەڵکی هەر وڵاتێك.

**سلاڤی یان سلاڤی کڵێسا:** جۆرە شێوازێکی کۆنی زمانی ئەمڕۆی بولگارییە. لە کۆتایی دەسەڵاتی بێزەنتیەکاندا، چەندان دەقی ئاینیی پێ نووسراوەتەوە. ئەو دەقانە لە سێرمۆنییەکانی ناو کڵێسای ئەرتەدۆکسی سلاڤیدا سوودیان لێوەردەگیرێ زمانەکە بە ئەلفەبێتی کیریلی دەنووسرێت کە لە بنەڕەتدا لە گریکی وەرگیراوە.

جگە لەو زمانانەی سەرەوە کە هەندێکیان تا ئێستاش بە شێوەیەك لە شێوەکان زیندوون و هەندێکیشیان پتر وەکو دەقی پیرۆزی ئاینی پارێزراون، چەندان زمانی کۆنی تریش رۆڵی ئاینییان هەبووە. یەکێ لەو زمانە کۆنانەی کە بۆ سێرمۆنیی ئاینی سوودی لێوەرگیراوە زمانی سۆمەرییەکان بوو. دوای نەمانی دەسەڵاتی سۆمەریان بە سەدان ساڵیش، زمانی سۆمەری لای بابلیەکان بۆ سێرمۆنیی ئاینی بەکار دەهات، زمانی ئارامیش لە قۆناغێکدا وەکو زمانی ئاینی سوودی لێوەردەگیرا. لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئاینی مەسیحیش ئارامی زمانی ئەو ئاینە بوو، کە پێی دەگوترا سریانی. **پرشتینا** دەقێکی هەرە کۆنی ئینجیلە بە سریانی. بە هۆی لێکترازانی کڵێسایی لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی زاینیدا، ناوەندی ئاینی مەسیحی لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا گوێزرایەوە، زمانی ئارامیش بایەخی ئاینی کەم بووەوە تا هاتنی عەرەب بۆ ناوچەکە. دوای باڵادەستبوونی عەرەبی، ئارامی تەنیا وەکو چەند زاراوەیەکی پەرش و بڵاو لە ناوچەکەدا ماوەتەوە.

## زمان هەڵگری رازو نهێنییەکانی مێژوو

زمانزانان و لێکۆڵانی زمان، هەر زوو هەستیان بە خزمایەتی و لێکچوونی هەندێ زمان کرد. ئەم لێکچوونە لە زۆر کۆنەوە سەرنجی مرۆڤی بۆخۆی راکێشاوە. لە سەردەمی کۆندا، گەلان بە گوێرەی زمان کرابوون بە نەوەی جۆراو جۆری کوڕەکانی نوح.

ناوە ئاینییەکانی رەگەزی مرۆڤ ئەمەندە بە فراوانی بڵاوبووەوە کە تا ئێستاش کەم و زۆر لە نووسینددا بەکار دەبرێن وەك (سامیەکان) و (ئاریەکان) و هتد.

زمانزانان ئەمڕۆ لە جیاتی ئەم پۆلێن کردنە ئاینییە، پۆلێن کردنی زمانەوانی و ناوی جیۆگرافی بە پەسەند دەزانن.

زمانزانان تەنیا لە رووی لێکدانەوەی وشە و لێکچوونی وشەکانی چەند زمانێك زۆر راستی مێژوویییان بۆ روون بۆتەوە کە سەختە بەڵگەی مادی مێژوویی یان دۆزراوەی ئەرکیۆلۆجی بەم بەرەنجامە سەرسوورهێنەرە بگات. بۆ نموونە لە رێگای زمانەوە دەتوانین وەسفی باری کۆمەڵایەتی گەلانی هیندۆئەوروپی بکەین بەر لە جیابوونەوەیان لە یەکتری. هەروەها لە رێگای زمانەوە دەتوانین وەسفێکی جیۆگرافی نیشتمانی هاوبەشی گەلانی هیندۆئەوروپی بکەین. هەموو زمانە هیندۆئەوروپییەکان وشەی لێکچوویان بۆ باوك و دایك و کچ و برا هەیە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو گەلانە کاتێك کە پێکەوە دەژیان، خێزانیان هەبووە. هەروەها دەرگا و نهۆم و هەندێ پێکهاتەی تری ماڵ لە هەموو زمانەکاندا لێك دەچن و ئەوەمان پێدەڵێن کە ئەو میللەتانە لە خانو دەژیان و رەوەند نەبوون. دیسان ناوی کۆمەڵێك گیانەوەر و روەکی لەیەکچوو وەسفێکی جیۆگرافی نیشتمانی هاوبەشی گەلانی هیندۆئەوروپیمان بۆ دەنەخشێنێ. گا و چەقەل و رێوی و گورگ و پشیلە (کتك) و شور و هتد لە زۆربەی زمانەکان لە یەکتری دەچن بەڵام هەر گروپێکی زمان ناوێکی تایبەت بەخۆی بۆ ماسی هەیە. لێکۆڵینەوەی وردو سەرنج راکێش لەو بوارانەدا هەیە.

هەندێ جار مێژووی میللەتێك لەناو رستەیەکی کورتدا شاردراوەتەوە، بە شێوەی قسەی نەستەق یان پەندی پێشینان، نموونەیەکی باش بۆ ئەمە بنەچەی گەلی مەجەر یان هەنگاریە، لە یەکێ لە شەڕەکانی گەلی هەنگاری لەگەڵ پەلاماردەرانی تورکدا، هەنگاریەکان دەشکێن. سەربازێکی بریندار لە رێگای گەڕانەوەی، لادەداتە دێرێك بۆ پشودان، قەشەی دێرەکە بەزەیی پیادێتەوە و دڵی دەداتەوە، سەربازەکەش بە پەندێکی پێشینان وەڵامی دەداتەوە کە دەڵێ: (براکانمان لە رۆژهەڵات دێن و فریامان دەکەون) قەشە زۆرجاری تر ئەم پەندەی بەر گوێ کەوتبوو، بەڵام ئەمجارە یەکەم جار بوو بیری لێبکاتەوە کە ئاخۆ بۆ ئێمەی هەنگاری لەکاتی تەنگانەدا ئەم قسەیە دەکەین! زۆری نەبرد قەشە تورەکەی هەڵگرت و رووی لە رۆژهەڵات کرد بەڵکو ئەو برایانەی بدۆزێتەوە.

با بیّینە سەر سەرەنجامی گەشتەکەی، دوای چەند ساڵێك لە باکووری دەریای خەزەر و لە ولاّتی بەشکیریای سەر بە فیدرالی رووسیا، بە خەڵکی چەند دێیەك دەگات کە بە زمانی هەنگاری دەدوان. قەشە سەری سوورما کە ناوی هەندێ روبار و شاخ و شاری بەشکیریا هەمان ئەو ناوانەن کە لە هەنگاریا هەن. ئێستا لای مێژوونووسان ئاشکرایە کە هەنگاریەکان لە ئاسیاوە بۆ ولاّتی ئێستایان کۆچیان کردووە. هەر لە رێگای زمانەوە بۆیان دەرکەوتووە بە چ رێگایەك و بەناو چ ولاّتێکیشدا تێپەڕیون، زۆری ژمارەی وشەی هەندێ زمان، ئەوە روون دەکاتەوە کە بە رێگاوە لەناو ئەو ولاّتەدا زۆرتر گیرساونەتەوە.

زمانناسانی کوردستان کاری زۆریان لەپێشە، تا لە رێگای زمانەوە هەندێ رازی مێژوویی ولاّتەکەمان ئاشکرا بکەن. یەکێ لەوانە بوونی پەڵەی دابڕاوی شێوە زاری هەورامی لە هەندێ شوێنی دوورە دەستی کوردستانە. لە ناوچەی ئاکرێ چەندان تیرە بە شێوەزارێکی نزیك هەورامی دەدوێن. زاری شەبەکەکانی نزیك موسڵ، جۆرێکە لە زاری هەورامی، زازاکانی باکوور، کە ئەوانیش بەیەکەوە لە یەکەیەکی جیۆگرافیدا ناژین، هەر لە بنەچەوە بە زاری هەورامی دەدوێن، بە رەچاوکردنی کاریگەری زار و زمانەکانی دەوروبەر لەسەریان. خەڵکی ناوچەی سێگردکانی سەر بە شاری تەق تەق (زێدی شاعیری ناسراو حاجی قادری کۆیی) تا ئێستاش بە زاراوەی کرماشانی دەدوێن. کوردانی خۆراسان و زاراوەی بە بنەچە کرمانجیی ئەوان سەرنجی ژمارەیەك مێژوونووسی راکێشاوە. لای خێڵی رەوەندی هەرکی تێبینی بوونی هەندێ وشەم کردووە کە لەگەڵ زمانی رووسی هاوبەشن، هەرکیەکان لە جیاتی (کێ؟) دەڵێن (کتۆ kto) کە بە زمانی رووسی هەمان وشە بە هەمان واتا بەکار دێت. هەر هەرکیەکان بە پەتاتە دەڵێن کرتۆفە کە دیسان لە رووسی وەرگیراوە. دەکرێ لە رێی سەرنجدانی وردتری زاراوەی هەرکیەکان، بزانین ئەوان کەی و لە چ رێگایەکەوە هاتوونەتە کوردستان؟ چ جۆرە تێکەڵاویەکیان لەگەڵ رووسەکان هەبووە و؟ لە کوێ؟

زمان، سەرەداوی زۆر رووداوی سەرنج راکێشی مێژوویمان، لە مێژووی هەرە پێشووی مرۆڤایەتی لە دەست دەنێ. هەندێ وشەی مێژوویی لە زمان هەن کە بۆ سەردەمەکانی سۆمەری، بابلی، میدی، ساسانی و گریکی دەگەڕێنەوە. ئێمەی میراتگری ئەو شارستانییە کۆنانە، هەندێ لە وشە باوەکانی ئەو سەردەمانە تا ئێستاش بەکار دێنن. وشەی کۆن، زۆر جار لە بەرگێکی تازە و بۆ مەبەستێکی نەختێ جیا بەکار دێت و

کەمێك لە واتا بنەرەتیەکەی دوور دەکەوێتەوە. زمانزانان دەتوانن رەگ و واتاو بنەرەت و بنەچەی ئەم وشانە بدۆزنەوە و دەرگای مێژوویەکی تازەو نادیارمان بۆ بکەنەوە.

## وشە وەرگرتن لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر

دیاردەی وشە لە زمانێکی تر وەرگرتن، بە ئەندازەی کۆنی زمان، کۆنە.

بە دەگمەن توشی زمانێکی دابڕاو دەبینەوە کە پەیوەندی لەگەڵ زمانانی تر نەبووبێت و نەبێت. تەنانەت خەڵکانی دورگە دابڕاوەکانیش هاموشۆی دورگەی ترو کۆمەڵگای تریان کردووە. هاموشۆو بازرگانی و تێکەڵاوی لە راو بەیەکتر گەیشتن، ئەو هۆکارە سەرەتاییانەن کە دوو زمان وشەیان پێ لەیەکتر وەرگرتووە. کە داهێنانێك یان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، لە کۆمەڵگایەك دێتە کایەوە، ئەوا زمان بە شێوەیەکی خۆکرد ناوو فرمان بۆ داهێنانەکە و دیاردەکە دەدۆزێتەوە. بە گواستنەوەو لەبەرگرتنەوەی دیاردەو داهێنانەکە، زۆرجار وشە بۆ بەکارهاتووەکەش لە زمانێکی تر وەردەگیرێ.

دەسەڵات و وڵات بەڕێوەبردن، هەمیشە پێویستی بە زمانێکی تەواو پەرەسەندو و گونجاو هەیە، تا هەموو پێویستیەکانی راپەڕاندنی کاروباری خەڵك و بەڕێوەبردنی دامودەزگاکانی پێ دەربردرێت. کاتێ کە خێڵێکی نیمچە کۆچەر، سوود لە بۆشایی دەسەڵات و نەبوونی هێز وەردەگرێت و دەکەوێتە لوتکەی دەسەڵات، زوو بۆی دەردەکەوێت کە زمانەکەی لە ئاست ئەو ئەرکە قورسەدا دەستە وەستانە. مێژوو نیشانمان دەدات کە خێڵ کێشەی زمانەوانی لەم جۆرەیان بە رێگا هەرە ئاسانەکە چارەسەر کردووە، واتا هێشتنەوە و پەیرەوکردن و بەکارهێنانی زمانی پێش خۆیان. عەرەبەکان کە وڵاتی ساسانیان گرت، ناچاربوون تا سەردەمی عەبدول مەلیکی کوڕی مەڕوان دەفتەری تۆماری باج و خەراج و بڕیارەکانیان هەر بە فەهلەوی بنووسن، چونکە زمانی عەرەبی، هێشتا لە ئاستی ئەرکەکانی بەڕێوەبردن و ئاراستەکردنی دامودەزگای دەوڵەت نەبوو. کە تورکەکانیش دەستیان بەسەر رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرت، رووبەرووی هەمان کێشە بوونەوە، ئەوانیش راستەوخۆ رویان لە زمانی فارسی نا تا لە رێگای ئەو زمانەوە، بتوانن کاروباری وڵات بەڕێوەبەرن. تورکانی سونە دوای ٤٥٠ ساڵێك ئینجا توانیان، زمانی تورکی بە هەزاران وشەی پێویست لە فارسی و عەرەبی متوربە بکەن و بەکاربێنن. کەچی تورکانی شیعە هەرگیز ئەمەیان بۆنەکراو لە بریتیدا ئەوان باوەشیان

بۆ زمانی فارسی کردەوە. یان دەکرێ بڵێین زمانی فارسی توانی وەڵامدەرەوەی پێویستی بەڕێوەبردنی دەوڵەتەکەیان بێت لە ئێران.

لێکۆڵینەوە لە وەرگرتنی وشەو بەدواداچوونی ئەو گۆڕانکارییە زمانەوانیانەی بەسەر وشەی وەرگرتودا دێت، ئێستا زانستێکی سەربەخۆیە و لە ژمارەیەك کۆلێژی زمانەوانی، خاوەنی وانەو ڕێچکەی خوێندنی تایبەت بە خۆیەتی، ئەو وشانەی کە دەشێن بێنە یان بهێندرێنە ناو زمانێکی تر و جێگای خۆشیان لە ناو ئەو زمانەدا بکەنەوە، هەموو جۆرە وشەیەك نین.

لێکۆڵەران سەرنجیان داوە کە (ناو Substantiv) لە پێشەوەی ئەو دەستە وشانەیە کە لە زمانێکەوە بە ئاسانی بۆ زمانانی تر دەچێت و جێگاشی هەروا بە ئاسانی دەبێتەوە، ناوەڕۆکی بابەت و شتیش لە دوای ناو، بە پلەی دووەم دێن. ئامرازەکانی پەیوەندی، پێشگر و پاشگر، یان ئەوانەی پێی دەڵێن وشە چالاکەکانی ناو زمان، نزیکەی هەرگیز وەرناگیرێن و نایەنە ناو زمانێکی تازە. (زمانی فارسی لەم ڕێسایە بەدەرە. گەر سەیری جۆری وشە عەرەبیەکانی ناوی بکەین چونکە عەرەبی هەر لە بنەڕەتدا، لە دروستکردنی زمانی فارسیی مۆدێرندا) بەشدار بووە.

وشەی دەگمەن و کەم بەکارهاتوو تایبەتمەند، پتر لە زمانی تر وەردەگیرێن، تا بە وشەی ئاسایی دەگات. ئەو وشانەی مرۆڤ بۆ پڕکردنەوەی پێویستی ڕۆژانەی و چالاکیەکانی، بەکاریان دێنێ، کەمتر لە زمانانی تر وەرگیراون. بەم جۆرە وشانە دەگوترێ وشەی ئەمباری بنچینەیی زمان. بەشەکانی لەشی مرۆڤ، ئەندامانی خێزان و پەیوەندییە خێزانییەکانیش، دەکەونە خانەی وشەی ئەمبارکراوی بنچینەیی، کە بە دەگمەن لە زمانانی تر وەردەگیرێن. زۆربەی هەرە زۆری فرمانە چالاکەکان، کە لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکار دێن، داهێنانی زمانی خۆماڵێن و وەرنەگیراون.

پرۆفیسۆر Martin Haspelmath لە ئینستیتوتی Max Planck لە شاری لایپزیگ، سەرپەرشتی پرۆژەیەکی نێو نەتەوەیی دەکات، کە چل زمانی دنیای لەخۆ گرتووە، بۆ دیاریکردنی جۆر و ژمارەو ڕێژەی وشەی وەرگرتو لەو زمانانە. هاسپێلمات دەڵێ، لە سەدا حەفتای ئەو وشانەی، کە دیاردە تازەو مۆدێرنەکان باس دەکەن، وەرگیراون. لە دوای دیاردەی نوێ، ئاین و ئایدۆلۆجیا، گەورەترین ڕێژەی وشەی وەرگیراو پێکدێنن کە سەرجەم چل و سێ لە سەدی وشەکانی ئەم بوارە وەرگیراون.

له دوای ئەمان، ئەم وشانە دێن کە پەیوەندیان بە خانوبەرە و ماڵەوە هەیە. ئینجا جل و بەرگ و دوای ئەوەش خۆرازاندنەوە و خۆماکیاژکردن.

بە پێی لیستێکی ئەم ئامۆژگایە، کە هێشتا بەرەنجامەکانی کۆتایی نین، رێژەی وشەی وەرگیراو لە هەندێ زماندا بەم جۆرەن: -

زمانی قەرەجەکانی سلۆڤاك: لە سەدا ٦٠

زمانی هاوای: لەسەدا ٥٩

زمانی رۆمانی: لە سەدا ٤٠

زمانی ئینگلیزی: لە سەدا ٣٩

زمانی ژاپۆنی: لە سەدا ٢٩

زمانی هۆڵەندی: لە سەدا ١٩

زمانی کریۆلی سیشیلی: لە سەدا ٨

زمانی مەندەرین (چین): لە سەدا ١

هەر زمانێك بە گوێرەی توانا و پێویستی خۆی وشە وەردەگرێت زمانی چینی لەهەر زمانێك کەمتر وشەی لە زمانانی تر وەرگرتووە چونکە بۆ هەر دیاردە و ناوێك، بڕگە هێمای خۆماڵی خۆی بۆ دادەندرێ، کە بۆ هەر شەش زمان یان زاراوەکە یەك چەشنە، بەڵام خوێندنەوەیان جیایە.

زۆر جار نووسەرانی کورد و نووسەرانی کوردینووس، وای لێکدەدەنەوە کە زمانی پاراوە ئەو زمانەیە کە وشەی بێگانەی تێدانییە، یاخود لە وشەی بێگانە پاك کراوەتەوە. لە راستیدا زمانی زیندو، باکی لە وەرگرتنی وشەی پێویست نییە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنانەی کە لەئەنجامی داهێنانی نوێ و دیاردەی نوێوە دێنە کایەوە. ئەمەش هەروا بە هەرەمەکی مەرجی و شەوەرگرتن و بێ پێوانە نابێت. بەڵکو دوای گونجاندنییەتی لەگەڵ شێوەی گۆکردن و شێوازی رێنووس و نووسینی زمانە وەرگرەکە.

زمانی کوردی وشەگەلێکی یەکجار زۆری لە زمانانی جۆراو جۆرو لە ژێر هەلومەرجی جیاجیادا وەرگرتووە. ئێمە هەر بۆ نموونە لە کۆتایی ئەم بابەتەدا هەندێ وشەی وەرگیراوی تەنیا دوو پیتی (1) و (2)مان ریز کردووە، تا ئاست و جۆر ورادەی وشەی وەرگیراوی ناو زمانی کوردی تێبگەین. سەرەڕای ئەو هەموو وشانەش کە لە زمانی ترەوە وەرمان گرتووە، ئێستا خەڵك واهەست دەکەن زمانی کوردی یەکێ لە

زمانە هەرە پاك و پاراو و پەتی و شیرنەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، لە راستیشدا وایە. زۆربەی هەرە زۆری ئەو وشە بێگانانەی کە هێنراونەتە ناو زمانی کوردی، لەگەڵ شێوازی گۆکردنی زمانی کوردی گونجێندراون و زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووە.

لە پرۆسەیەکی مێژووییدا زمانی عەرەبی و تورکی، کاریگەریان بەسەر زمانی کوردییەوە جێهێشتوە. ئەگەر کاریگەری عەرەبی لەسەر هەردوو زمانی تورکی و کوردی هەڵبسەنگێنین، بە خێرایی بەو بەرەنجامە دەگەین کە عەرەبی سێبەرێکی قورسی بەسەر زمانی تورکیەوە جێهێشتووە، سەرەڕای ئەوەش کە ئێمە نزیکەی ٥٠٠ ساڵ بەر لە هاتن و جێگیربوونی تورك لە تورکیای ئێستا، لە ژێر دەسەڵاتی عەرەباندا بووین، دوای ئەوەش بە پێچەوانەی تورکان، ئێمە لە باشوور و رۆژئاوا هاوسێی عەرەبین. دەکرێ ئەمە بۆ چەند هۆیەکی گرنگ بگێڕینەوە:

**یەکەم:** دەسەڵاتێکی حوکمڕانی بەهێزو ناوەندی لە کوردستان دروست نەبووە. دەسەڵاتی ناوەندی بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری رۆژانەی، پێویستی بە هەزاران وشەو زاراوەی تایبەتی هەیە لە بوارە زۆر و جۆراو جۆرەکانی: سوپا و لەشکر، خزمەتگوزاری، کاری دیپلوماسی و پەیوەندی بەستن، رێورەسمی دیوانی و پێشوازی لێکردن و پێشوازی کردن، داهات و باج و سوود، بازرگانی، وتووێژو دانوستان، یاسا و ماف و ئەرك و سزا، رێکخستنی ژیانی کۆمەڵایەتی و باری کەسی، لایەنەکانی تری ئاینی و هونەری و وێژەیی و هتد. . .

ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو گۆڤار ورۆژنامانەی کە لە ماوەی تەمەنی کورتی (حکومەتی کوردستانی جنوبی) بە رابەری (مەلیك مەحمودی یەکەم) دەرچوون، ئینجا بۆمان دەردەکەوێ، کە ئەگەر ئەو پرۆسەیەی دەسەڵاتە درێژەی هەبا، زمانی کوردی بۆ چ ئاقارێك هەنگاوی دەهاوێشت.

**دووەم:** تۆپۆگرافی ناوەوەی کوردستان، بە هۆی شاخی بەرز و دۆڵی قوڵ و بەفرو سەرما و سۆڵە، هەروەها نەبوونی رێگاوبانی گونجاو، هەرگیز لەبار نەبووە تا داگیرکەران بتوانن، تێدایدا نیشتەجێ بن، بە پێچەوانەی دەشتەکانمان، کە هەمیشە بوونەتە نشینگەی داگیرکەران. ئەمە وایکردووە کە خەڵکی کوردستانی ناوەوە، داب و نەریتی زمان و فەرهەنگەکەی، نەکەوێتە بەر هەرەشەی نەمان و گۆڕان. ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ئێمە خاوەن فۆلکلۆرێکی بێ ئەندازە دەوڵەمەند بین.

**سێیەم:** بزوتنەوەی نەتەوایەتیی کوردی، کە لە سالآنی سی سەدەی بیستەم، بوژایەوە، کەوتەخۆ تا زمان و داب و نەریت و کولتووری کوردی بپارێزێ و بنووسێتەوە. فۆلکلۆری کوردی لە لادێکان، کەرەستەیەکی یەکجار بە نرخ بوو بۆ ئەو نوێکرنەوەیەی زمان. زۆر بە ئاسانی تواندرا لە جیاتی وشە وەرگیراوەکان، جێگرێکی لە زمانی سادەی خەڵك بۆ بدۆزرێتەوە. ئەمانە هەموو وایان کرد کە ئێمە ئەمڕۆ ببین بە خاوەنی زمانێکی تا رادەیەکی باشی پەتی. بە داخەوە ئەم نوێکردنەوەیە، لە بواری نووسینەوەی رێزماندا سەرکەوتوو نەبوو، ریزمانی کوردی لەژێر کاریگەری رێزمانی کۆن و کلاسیکی عەرەبیدا نووسراوەتەوە، بۆیە نەتوانیویەتی ببێ بە دەستوورێکی گشتی بۆ زمانەکە و نەتێگەیشتنیشی بۆ خوێنەر ئاسانە. ئەمڕۆ، دەسەلآتی کوردی، بە رەنج و ماندووبوون تەنیا دوو نەوەی پێش ئێستا، خاوەنی زمانێکی بەڕێوەبەرایەتی، تا رادەیەکی باش گەشە کردووە. بەلآم هێشتا زمانی کوردی، نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی، تا وەلآمدەرەوەی هەموو پێویستیەکانی دەسەلآت و بەڕێوەبردن بێت. ئێستاش کاربەدەستان و یاسادانەران، بەناچاری پەنا بۆ زمانی عەرەبی دەبەن، تابتوانن دەربڕینەکانیان، ئەوپەڕی وردەکاریی یاسایی تێدابێت، بەتایبەت لە بوارەکانی: دەستووری، یاسایی، شەرعی، باری کەسی، مولکداری و زۆر بواری تری کاروباری رۆژانە.

لە دەزگاکانی راگەیاندنیشدا، توشی کێشەی زمان و دەربڕین دەبین. ئەوانەی قسە دەکەن، ئەو زمانە پەتیە بەکارناهێنن کەراهاتوون پێی بنووسن. دیارە ئەمانە هەمووی کێشەی گەورەنین و نابنە یەکخستنی زمان. بەلکو دەکرێ بە وشیارانە ئەم کەمووکوڕیانە بەشێوازی جیاجیای وەك داتاشین، وەرگرتن و دۆزینەوە چارەسەر بکرێن.

زمانە پاراوو پاکەکەی ئێمەش، وەك هەرزمانێکی زیندوو چالاکی ئەم چەرخە، بۆ پڕکردنەوەی پێویستیەکانی خۆی، بەدرێژایی رەوتی گەشەکردنی، ژمارەیەکی زۆر وشەی خوازراوی کوردادندووە. وشە وەرگیراوەکانی زمانی کوردی، بەپێی گونجاندنی رێزمانی، یان شێوەی کوردیانەی گۆکردن، یاخود بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. یاخود جاری وا هەیە وشەی خوازراو کتومت وەرگیراوە و پێویستی بە هیچ گۆڕانێك نەبووە، زۆرجار وشەی خوازراو لە زمانی کوردیدا، بەهۆی پێشگر یان پاشگرێکەوە یان پێشگرو پاشگرەوە، بەرگێکی کوردی بە بەرداکراوە وەك وشەکانی: **نەفام، خنکان، بە هیچ کلۆجێ، ئامۆزا، دەمشە، زارۆك، زێدەبوویی، رازی کردن، زێتر، زێدەرۆیی،**

**هەولێدان، خزمەتکار، ملکدار، ئەدەب سز، دەماغ سز، قوتابی، بێتام، تانە، کتێبخانە** و سەدان و سەدان وشەی تریش.

هەروەها سەدان ناوی بێگانەش، لەناو زمانی کوردیدا جێگای خۆیان کردۆتەوە. زۆربەی ناوە بێگانەکان ئاینین. هەندێ لە ناوە ئاینییەکان لە ئاینی جولەکەیی وەرگیراون بەڵام لە رێگای ئاینی ئیسلامەوە کەتونەتە ناو کوردان. بێگومان بە هۆی هاوسێیەتی و دەسەڵاتی وڵاتانی داگیرکەریشەوە، ناوێکی زۆری بێگانەمان بۆ هاتووە، نمونەی ناوی باوی بێگانە بە بەرگی کوردییەوە، ئەمانەن: **هۆمەر، ئاودەڵ، وەتمان، ئەحمەد، بابەکر، بایز، خدر، عەولاً، عەبۆ، ئیبۆ، عەزۆ، هەمین، فاتم، عەیشێ، ئایش، خەجێ، حەپسە** و زۆری تریش. بۆ ئەوەی لە ئاست و رادەی وشەی بێگانە لەناو زمانی کوردی بگەین، دەکرێ لە سەیری هەندێ لەو وشانە بکەین کە پیتەکانی (ئـ و ش و ك) دەست پێدەکەن.

| ئـ | ئـ | ش | ش | ك | ك |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەپارتمان | ئەدەب | شاسی | شەیتان | کاسە | کیلۆمەتر |
| ئەکادیمی | ئەرپەل | شاعیر | شێخ | کارت | کیلۆگرام |
| ئادەمیزاد | ئەزیەت | شانس | شەرەف | کارتۆن | کیلۆوات |
| ئادار | ئەقل | شانۆ | شوم | کارەبا | کیمیا و |
| ئارەقە | ئەکتەر | شایەد | شـــــعروزۆری | کاسبی | زۆری تریش |
| ئارەق | ئەلبوم | شخارتە: شقارتە | تریشش | کافور | |
| ئارشیف | ئەلحەد | شرنقە | | کەکاو | |
| ئازیز | ئەلفوبێ | شریت | | کالۆری | |
| ئاژانس | ئەلەتریك | شفرە | | کامل | |
| ئاشق | ئەلەکترۆن | شك | | کانونی یەکەم | |
| ئاغا | ئەلقە | شکات | | کانونی دووەم | |
| ئافات | ئەلەمنیۆم | شۆستە | | کتێب | |
| ئافرەت | ئەنجومەن | شۆك | | کرێم | |
| ئافەت | ئەنزیم | شۆکۆلات | | کفر | |
| ئاقل | ئەنسکلۆپیدیا | شەمپانزی | | کفن | |
| ئالیوم | ئەنفلۆنزا | شۆرت | | کلۆر | |
| ئالتون | ئەیلول | شوفێر | | کۆمۆنیزم | |
| ئایەت | ئیلهام | شوبات | | کۆمیتە | |
| ئۆپۆزسیۆن | ئیمپراتۆری | شەبقە | | کلێسە و | |

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئۆتۆماتیك | ئیمپریالیزم | شەترەنج | | کەنیسە | |
| ئۆتۆمبێل | ئیمزا | شەراب | | کۆنگرە | |
| ئۆردوگا | ئیملا | شەربەت | | کورتاژ | |
| ئۆرگان | ئێزگە | شەفت | | کۆمپیالە | |
| ئۆکسجین | ئێستگە و | شەکر | | کوپ | |
| ئۆقیانووس | زۆری تریش | شەکردان | | کەتەلۆگ | |
| ئۆکۆردیۆن | | شەکرە | | کەفیل | |
| ئۆلۆمپی | | شەمەنەفەر | | کەمان | |
| ئوتو | | شەوق | | کێبڵ | |
| ئەتك | | شەهید | | کیس | |
| ئەتۆم | | | | کیلۆ | |

## خزمایەتی لە نێوان زماناندا

ئەو زمانانەی کە خزمایەتیان لەگەل یەکتری هەیە و وا دادەنرێت کە بنەڕەتیان یەکە، یەك خێزانی زمان پێك دێنن، خێزانە زمانیش بەش بەحاڵی خۆی بۆدەستەو بندەستە پۆلێن دەکرێن. لە هەندێك باردا دیاری کردنی خزمایەتی لە نێوان دەستە زمانێکدا زۆر ئاسانە. وەکو دەستە زمانی رۆمانی (لاتینی ) یان دەستە زمانی سلاڤی. لە باری تریشدا ئەم دیاری کردنە زۆر گرانترە، جاری وادەبێ کە لێکۆڵی جیاجیا بە بەرەنجامی جیاجیا دەگەن. دۆزینەوەی تازە جاری وابووە بۆتە هۆی هەڵوەشانەوەی بیردۆزەیەکی کۆن لەسەر خێزانە زمانێك یان دەستە زمانێك یاخود زمانێکی تایبەت.

هەموو لێکچوونێکی نێوان زمانان، واتای خزمایەتی و هاوڕەگی ناگەیەنێ. ئەگەر زمانێك بەشێك لە عەمباری وشەکانی خۆی لەزمانێکی ترەوە وەرگرتبێت، ئەوە بەو واتایە نییە کە ئەو دوو زمانە خزمایەتیەکیان لە نێواندا هەیە. لاسایی دەنگی وشە، یان ئەوەی لە زماندا پێی دەگوترێ (ONOMATOPOETI) دەکرێ لە دوو زماندا زۆر لە یەك بچن، بێئەوەی ئەو دوو زمانە خزمایەتیان لە نێواندا هەبێت. زۆر لە لێکۆڵەوانی زمان لایان وایە وشەی، ماما، مۆم، مامی، مامە و کە لە زۆر زماندا بۆ دایك بەکار دێت، لە گڕوگاڵی منداڵی ساوا وەرگیراوە. بە گوێرەی بیردۆزەیەك، دەبێ هەموو زمانەکانی مرۆڤ لە بنەڕەتدا لەیەك زمان هاتبن. بەڵام ئێمە ناتوانین لەوە دڵنیابین کە

کەی ئەو مرۆڤە پێش مێژووە بەو پێیە زمانە دواوە. هەروەها ناشزانین ئەو زمانە کۆنە لە یەك شوێنی سەر زەوی، یان لە چەند شوێنێکی جیاواز و لە یەك کاتدا قسەی پێکراوە. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان زمانێکی هاوبەشیشان هەبوبێت، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێم سەلماندنی.

**خێزانە زمانە ناسراوەکانی ئەمڕۆ لە سەر گۆی زەوی ئەمانەی خوارەوەن:**

**زمانە هیندۆئەوروپییەکان:** گەورەترین و بەربلاوترین خێزانە زمان لە سەر ڕووی زەوی زمانە هیندۆئەوروپییەکانە. زمانی کوردی، هەر وەك زۆر لە زمانەکانی ئەوروپا و بەشێکی ڕۆژئاواو خوارووی ئاسیا (باکووری هیندستان، پاکستان، ئەفغانستان، ئێران و هتد) سەر بەو خێزانەن. هەندێ لە زمانە هیندۆئەوروپییەکان بەتایبەت ئینگلیزی، فرەنسی، ئیسپانی و پورتوگالی، زوتر و لە ڕێگای دەسەڵاتی هەندێ وڵاتی کۆلۆنیالیستی ئەوروپیەوە، لە دەرەوەی ناوچەی بنەڕەتی خۆیاندا، زۆر بەفراوانی بلاو بوونەتەوە: ئێستا زمانە هیندۆئەوروپییەکان لە لایەن ڕەگەزی جۆراو جۆرەوە وەکو زمانی زگماك بە کاردێت. ئەم خێزانە زمانەیە باشترین بەڵگەیە کە زمان و ڕەگەز دووشتی لێکجیاوازن و نابێ تێکەڵ بکرێن.

**خێزانی زمانە هیندۆئەوروپییەکان.** ناسراوترین خێزانی زمانن، لە هەموو خێزانە زمانەکانی تریش پتر لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە. زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپییەکان ماوەیەکی یەکجار درێژە پێیان دەنووسرێ. هەندێ لەو زمانانە خاوەنی دەقی وێژەیی ئەوتۆن کە بۆ سەردەمانێکی مێژوویی زۆر کۆن دەگەڕێنەوە. هەروەك هیندی کلاسیکی یان سانسکریتی، گرێکی، لاتینی و فارسی.

**چینی.** زمانێکی داخراو: خێزانی (سینۆ تیبێتی) لە ڕووی ژمارەی ئەو کەسانەی قسەی پێدەکەن، دووەمین خێزانە زمانی گەورەی زەوییە. لێکۆڵەران، زمانی چینیشیان لەگەڵ ئەو خێزانە زمانەدا پۆلێن کردبوو. ڕاستر ئەوەیە کە خێزانی (سینۆ تیبێتی) خێزانە زمانێکی زەبەلاحن (سوپەر خێزان) کە نەتواندراوە پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان زمانەکانی ناویدا، بسەلمێندرێت. گونجاو ترە کە زمانی مەزنی چینی وەکو زمانێکی دابڕاو و داخراو چاوی لێ بکرێت. بەمەش لە خێزانی زمانەکانی (تای)و خێزانی (تیبێتە- بورمایی) جیادەبێتەوە. لێکۆڵەوان تا ئێستا بۆ یان دەرکەوتووە جگە لە زمانی چینی، چەند زمانێکی تریش هەن کە سەر بە هیچ خێزانە زمان یان دەستەیەکی

زمان نین. لە زمانە دابراوە ناسراوەکان: ژاپۆنی، کۆریایی لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، باسکی لە ئەورووپا.

## خێزانی زمانە ئەفرۆ ئاسیاییەکان

لە کۆنترین دەستە زمانێک کە شوێنەواری نووسراوی لە دوای خۆی بۆمان جێهێشتبێ، زمانە سامیەکانن. نووسراوەی کۆنی ئەکەدی پارێزراوە کە بۆ هەزارەی سێیەمی پێش زاین دەگەڕێنەوە. فەینیکیەکان شێوازێکی نووسینیان داهێنا کە دواتر بوو بە بناغە بۆ زۆربەی ئەلفوبێی سیستێمی نووسین. هەندێ لە زمانەکانی ئەم خێزانە ڕۆڵی مێژوویی بەرچاویان هەبووە. زمانی تەورات واتا عیبری، وەکو زمانێکی ئاینی، درێژەی بە کاروانی خۆی دا، تاسەد ساڵێك پێش ئێستا نوێ کرایەوە و بوو بە زمانێکی مۆدێرنی خوێندن و نووسین زمانی ئارامی، لەسەردەمی عیسای مەسیحدا، و پێش ئەوەش، ببوو بە زمانی لێکتێگەیشتنی گشتی لە هەموو ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. زمانی عەرەبی، ئەمڕۆ گەورەترین زمانی ئەو خێزانەیە. لە ڕێگای شێوەزاری عەرەبی دورگەی ماڵتە، ئەم زمانە لە ئەورووپاش شوێنی خۆی کردۆتەوە. لە وڵاتی ئەتیوپیا چەند زمانێکی ئەم خێزانە قسەیان پێدەکرێ کە گرنگترینیان زمانی (ئەمهەریە).

لێکۆڵەران، نزیکەی زوو هەندێ نیشانەیان دی کە پەیوەندی و خزمایەتیی دیار دەردەخا لە نێوان ئەو زمانانەی کە پێیان دەگوترێ زمانە سامیەکان، لەگەڵ هەندێ زمانی تر، بە تایبەت ئەو زمانانەی کە لە باکووری ئەفریقا بەکاردێن، و زمانی کۆنی میسریەکان. بەم جۆرە زمانەکانی باکووری ئەفریقا کە جاران پێیان دەگوترا (زمانە حامیەکان) و ئێستا واز لە بەکارهێنانی ئەو ناو لێنانە ئاینییە هێنراوە. لەگەڵ زمانەکانی تر کە بە سامی دەناسرێن خرانە خێزانە زمانێك. ئەو زمانانە ئەمڕۆ خێزانێکی گەورەی زمانی ئەفرۆ ئاسیایی پێك دێنن کە جگە لە زمانە سامیەکان، زمانی ئەمازیغی (بەربەری)، چادی، کوشیتی، زمانی کۆنینەی میسری و زمانی ئاینی قیبتی، لە خۆ دەگرێ.

**ئەوراسیا:** نۆڤیانووس، کۆمەڵێك خێزانە زمان لە ژێر ئەم ناوەدا کۆ کراونەتەوە کە پەیوەندی نزیکی نێوان خێزانەکانیان نەسەلمێندراوە یاخود، سەر بە خێزانی لێك جیان و تەنیا هەڵکەوتی جیۆگرافی، لە ژێر یەك ناونیشان کۆی کردوونەتەوە. یەکێ لە خێزانە

گەورەکانی ئەم دەستەیە، زمانەکانی (ئالتای)ن. شێوەزارە جۆراو جۆرە تورکیەکانی ناوەڕاستی ئاسیا و تورکیای ئەمڕۆ گەورەترین بەشی ئەم خێزانە پێك دێنن، خێزانی ئورالیش دەکرێن بە دوو دەستە (فینی - ئۆگری ) زمانەکان و دەستەی بچکۆلەی (سامۆیێدی) کە تەنیا ٢٥٠٠٠ هەزار کەس لە سێبیریا قسەی پێدەکەن، زمانە زۆر ناسراوەکانی دەستەی (فینی - ئۆگری ) بریتین لە زمانەکانی فینلەندی، ئێستی، سامی و هەنگاری. هەندێ جار تێرمی (ئورال ئالتای) بەکار دێت بۆ هەردوو خێزانە زمانەکە، کەچی تا ئێستاش لێکۆڵەوان نە یانتوانیوە پەیوەندی خزمایەتی لە نێوان خێزانەکانی ئورال و ئالتا بسەلمێنن.

**زمانە دراڤیدیەکان:** کە پتر لە خوارووی هیندستان قسەیان پێدەکرێ، چوار زمان لە خۆی دەگرێ. تامیلی زۆر تر ناسراوە. لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و دورگەکانی ئۆقیانووس (ئوسیان)دا خێزانی (مالایۆ - پۆلینیزی) گرنگترین خێزانە زمانە. خێزانەکە دوو چڵی لێدەبێتەوە، چلی ئیندۆنیزی (مالایزی) و چڵی پۆلینیزی (ماوری، تاهیتی و هتد ).

زۆر جار ئەو زمانانە، بە زمانەکانی مێلانیزی و میکرۆنیزی دەریالوشی نارامیشەوە، لە یەك خێزانی زەبەلاح کۆ دەکرێنەوە بە ناوی زمانەکانی (ئەوسترۆنێیزی).

**ئەفریقا:** خوار بیابانی گەورە: جاران هەموو زمانە جۆراو جۆرەکانی ئەفریقای رەش، بەسەر دوو خێزاندا دابەش کرابوون: زمانەکانی (بانتو) کە ٦٠٠ زمانی دەگرتە خۆی. زمانەکانی (سوودان)یش کە هەموو ئەو زمانانەی تری تێدا ئاخنرابوون. ئێستا جۆرە دابەشکردنێکی تر باوە کە پتر پشت بە گریمانە دەبەستێ و نەسەلمێندراوە: زمانەکانی نیجەر– کۆنگۆ کە ئەم زمانانەش لە خۆ دەگرێت (بانتو، ماندێ و زمانەکانی رۆژئاوای ئەتلانت و هیتریش). هەروەها زمانەکانی (نیل - سەحرا). خێزانێکی لە یەکچوو لە خوارووی ئەفریقا هەیە لە زمانەکانی (خۆی = هۆتێنتۆت، سان = بوشمان). هەر لە بەشی خوارووی بیابانی گەورەی ئەفریقا هەندێ زمان قسەیان پێدەکرێت کە سەر بە خێزانی زمانەکانی ئەفرۆ ئاسیان وەك زمانی (هاوسا). لە دورگەی مەدەگاشکەری کەناری رۆژهەڵاتی ئەفریقا بە (مالاگاشی) قسە دەکرێت کە سەر بە خێزانی(مالایۆ - پۆلینیزی)یە

**جیهانی نویٚ خێڵه ئیندیانەکان:** (هیندە سوورەکان ) ئێستا بە پتر لە ١٠٠ زمان قسە دەکەن کە بە سەر هەرسێ ناوچەی باکور، ناوەڕاست و باشووری دوو کیشوەری ئەمریکادا بلاون. گەورەترین زمان لە ئەمریکای خوار و زمانی (کیچوا)یە کە زمانی گەلی مێژوویی (ئینکا)یە. دوای ئەمە گوارانی دێت. زمانە ئیندیانەکانی جیهانی نویٚ بەسەر ژمارەیەکی زۆر خێزانە زمان دابەشکراون. بەلام هۆکاری پۆلێن کردنیان وەك یەك نییە.

**خەلکی بومی و بنەڕەتی ئوستراليا** بە ١٥٠ زمان قسە دەکەن. دوور نییە هێشتا پتریش بێت. زۆربەی ئەو زمانانە خزمایەتیان لەگەلٚ یەکتری هەیە. هەمان شتیش راستە بۆ ئەو ٧٠٠ زمانەی پاپوان کە لە دورگەی گینیای نویٚ قسەیان پێدەکرێت.

لە کۆتاییدا دەبیٚ ئەوە بلێم کە دەکریٚ زمان لە سەر بنچینەی تری جیا لە خزمایەتی پۆلێن بکرێت. بۆ نموونە لە سەر چۆنییەتی دەربرین یان هەندیٚ بابەتی رێزمانی. جاری وایە هۆکاری جیۆگرافی دەبێتە هۆی پۆلێن کردنی زمانانی شوێنێك، یاخود هۆکاری ئێتنی و رەگەزی، وەك لە پۆلێنکردنی زمانی هیندە سوورەکاندا دەیبینین. کاتیٚ کە لێکۆلەوان ناتوانن بە تەواوی خزمایەتی کۆمەلە زمانێك بسەلمێنن، ئەو کاتە پەنا بۆئەو هۆکارانەی سەرەوە دەبەن.

خێزانی زمانە هیندۆئەوروپییەکان: تا ئەمرۆ ئەم دە دەستە زمانە پۆلێن کراون:

**زمانە جێرمانییەکان:** (زمانەکان بە گوێرەی ژمارەی ئەو خەلکانەی قسەی پێدەکەن ریزبەند کراون) ئینگلیزی، ئەلمانی، دانمارکی، ئەرویجی.

ئەفریقان (شێوەزارێکی هۆلەندیە، سپی پێستەکانی خواروی ئەفریقا پێی دەدوێن )

دانمارکی

ئەرویجی

ئەلمانی خوارو (سوت دۆچ، جاران لە خاکی چیك دەژیان، دواتر لە شەری دووەمی جیهانیدا دەرکران)

سکۆتی

لوکسەمبورگی

فریسیس (دورگەیەکی سەر بریتانیایە )

ئیسلێندی

یدیشل (زمانی جولەکەکانی ئەوروپایە، لە ئەڵمانی دەچێ لە ژێر کارلێکەری پۆلۆنیدا)

ڤێری (دورگە رەنگاو رەنگەکان، سەر بە دانمارکە لەو پەڕی دەریای باکوور)

## زمانە رۆمانییەکان (لاتینی)

ئیسپانی

پورتوگالی

فرەنسی

ئیتاڵی

رۆمانی

کەتەلانی

مۆڵداڤی (زاراوەیەکی رۆمانییە)

ئۆسیتی

گالیسی

ساردی

رێتۆ رۆمانی

کۆرسیکی

## زمانەکانی کێلتی

والێسی

بریتۆنی

سکۆتی گێلی

ئیریش (ئیرلەندە)

مانکس

## زمانە بالتیکیەکان

لیتاوی

لێتی

## زمانە ئەرمەنییەکان

ئەرمەنی

**زمانە ئێرانییەکان**

فارسی و دەری

کوردی

پەشتۆنی

تاجیکی (زاراوەیەکی فارسیە)

بەلوچی

ئۆسێتی و هیتریش

**زمانە سلاڤیەکان**

رووسی

ئۆکراینی

پۆلۆنی

سێربۆ — کرواتی

چیکی

بیلە رووسی

بولگاری

سلۆڤاکی

سلۆڤێنی

مەکەدۆنی

**زمانە هیندیەکان**

هیندی

بەنگالی

پەنجابی

بیهاری

ماراتی

ئوردو (شێوازێکی هیندیە)

گوجاراتی

راجاسانی

ئۆریا

سینگهالی

ئاسامی

سیندهی

رۆمانی (زمانی قەرەجەکان)

مالدیڤی و هیتریش

**زمانە گریکیەکان**

گریکی (یۆنانی)

**زمانە ئەلبانییەکان**

ئەلبانی




**خێزانی زمانە هیندۆ ئەوروپییەکان**

## زمانی ئیمپراتۆریا

له مێژووی ناسراوی مرۆڤایەتیدا، چەندان ئیمپراتۆریا هاتوونەتە کایەوە. زۆر لەو ئیمپراتۆریانە. رووبەرێکی گەورەی زەویان دەستبەسەرداگرتووە. لە ناو سنووری ئیمپراتۆریاکاندا، میللەتانی جۆراو جۆر و زمانی جۆراو جۆر هەبووە.

هەڵسوکەوتی ئیمپراتۆریاکان لەگەڵ زماندا، جێگای سەرنج و لێکۆڵینەوەی هەندێ لە زمانناسان بووە. ئەگەر بێتو ئیمپراتۆریاکانی مێژوو، لە رووی زمانەوە پۆلێن بکەین، ئەوا دەتوانین بەسەر دوو دەستەدا دابەشیان بکەین:

١-ئیمپراتۆریای خاوەن پەیامی زمان.

٢-ئیمراتۆریای بێخاوەن پەیامی زمان.

لە مێژوودا ژمارەیەك ئیمپراتۆریا هەن کە هەلگری پەیامی زمانێکی دیاریکراو بوون. دەتوانین هێما بۆ ئیمپراتۆریای گرێك بکەین لە سەردەمی هێلینیدا. واتا لە سەردەمی ئەسکەندەری گەورە (٣٣٧ – ٣٢٣، پ ز) و نەختێك دوای ئەوەش. گرێکەکان، بۆ هەر کوێیەك چووبن و دەستیان بە سەر هەر وڵاتێکدا گرتبێت، ئەوا هەوڵیان داوە، زمان و دابونەریتی گرێکی لەو شوێنە تازانەدا بچەسپێنن. بە هۆی ئەوەی کە گرێکەکان ئەو سەردەمە، شارستانییێکی پێشەنگ و پێشکەوتویان هەبوو، زمانەکەشیان کە هەلگری ئەو فەرهەنگە پێشکەوتووە بوو، جێبایەخی خەلکانی تر بوو. زمانی گرێکی دوای لە ناو چوونی دەسەلاتی گرێکەکانیش، لە نرخی فەرهەنگی کەم نەبوودوە و زۆر ژیا. کە ئیمپراتۆریای رۆم دامەزرا، زمانی گرێکی. سەرچاوەیەکی گرنگی زانین بوو بۆیان. رۆمەکان هەر زوو خۆیان کرد بە خاوەنی ئەو فەرهەنگە دێرینە. دوای لەتبوونی ئیمپراتۆریای رۆم بۆ دوو لەتی رۆژهەلات و رۆژئاوا (٢٩٣ زاینی). بەشی رۆژهەلاتی ئیمپراتۆریاکە کە بە (رۆمی بێزەنت) دەناسرێ، زمانی گرێکی وەکو زمانی دیوانی دەسەلات و ئاین، هێشتەوە. دوای روخانی ئیمپراتۆریای رۆمی بێزەنتی، لەسەر دەستی تورکانی عوسمانیدا (١٤٥٣ زاینی)، زمانی گرێکی، وەکو زمانی، ئاین، لای ئەرتەدۆکسەکان مایەوە.

ئیمپراتۆریای چینیش بە پەرەسەندن و بلاوبوونەوەی، کەوتە بلاوکردنەوەی شێوەزاراوەکانی چینی لە سنوورە تازەکانیدا. زمانی چینی، لە ماوەیەکی کورتدا، بوو بە زمانی خەلکانێکی زۆری ناو ئیمپراتۆریای چین.

ئیمپراتۆریای ئیسلامییە یەك لە دوای یەکەکان، لە نێو ئەو دەسەڵاتانەن کە هەڵگری شێلگیری پەیامی بڵاوکردنەوەی زمان بوون. زمانی عەرەبی، لەگەڵ سەرە شمشێرو سمی ئەسپی عەرەبەکان و پەیامی ئاینیی ئەواندا بووە، بۆ هەر کوێیەك چووبن. لە ماوەیەکی کورتدا زمانی عەرەبی لە ناوچەیەکی پانوبەرین بڵاببووەوە. دەسەڵاتی تێکەڵاوی بەربەر– عەرەبی – ئیسلامی لە ئەندەلوس، سەرەڕای ژمارەی کەمی عەرەبیش لەوێ، لەو نیوە دورگەیەدا توانیان بەسەرکەوتویی زمانی عەرەبی بچەسپێنن. لە بەشەکانی دیکەی ئەم بابەتەدا باسی ئیمپراتۆریا تازەکانمان کرد کە پتر بە کۆلۆنیالیزم دەناسرێنەوە. لە رێگای کۆلۆنیالیزمەوە، زمانی ئیمپراتۆریای، ئیسپانی، ئینگلیزی و فرەنسی، هەموو سنوورێکی جیۆگرافی پێشتر ناسراو و نەناسراویان بەزاند. تەنیا رووسەکان، نەیانتوانی لەم بوارەدا سەرکەوتنی بەرچاو بە دەست بێنن. هاوکات لەگەڵ ئەو ئیمپراتۆریانەی کە خاوەنی پەیامی زمان بوون، هەمیشە دەسەڵات و ئیمپراتۆریای تریش هەبوون، لەبەر هۆکاری جیاواز، زمانی خۆیان نەکردۆتە زمانی دیوانی بەڕێوەبردن یان لانی کەم لە قۆناغی بەرایی دەسەڵاتیاندا خاوەنی زمانێکی دیوانی بێگانە بوون.

ئیمپراتۆریای بابل لە سەرەتاوە زمانی سۆمەریان بەکارهێنا. زمانی سۆمەری وەك زمانی ئاین و بەڕێوەبردن، رەگی لە مێژینەی هەبوو، هەر بۆیەشە لە پەرستگاکانی بابلدا هەر بەکار دەهات.

دیسان ئاشوورییەکان، نەك هەر نەیانتوانی زمانی خۆیان بکەن بە زمانی ئیمپراتۆریاکەیان بەڵکو خۆشیان شەیدای زمانی ئارامی بوون، ئارامی کە لە جیاتی هێما بەپیت دەنووسرا، نووسین و بەکاربردنی زۆر ئاسان بوو، هەر بۆیەشە جێی بە هەموو زمانە زگماکەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەق کردبوو، زمانی ئارامی، دوای نەمانی ئاشوورییەکان، لە ناوچەکەدا هەرمایەوە. ئارامی شان بەشانی گرێکی، زمانی دیوانی دەسەڵات بوو لە سەردەمی پارتەکاندا (٢٤٧ – ٢٢٤ پ ز) هەروەها ساسانییەکانیش هەرگیز لە بیریان نەدەکرد، شتە گرنگەکانیان بە ئارامی لە سینگی کێواندا تۆماربکەن. لە ئیمپراتۆریا هاوچەرخەکاندا، تورکی عوسمانی باشترین نموونەن لەسەر پشتگوێ خستنی زمانی زگماك. عوسمانییەکان کە دەسەڵاتیان لە ناوچەکە دامەزراند (١٣٠٠ ) زاینی کەوتنە نێوان دوو تاتە زمانی زۆر بەرز. زمانی عەرەبی، کە

زمانی پیرۆزی قورئان بوو، هەروەها زمانی فارسی کە زمانی ئەدەب و نووسین بوو. دەسەڵاتدارانی عوسمانی، پشتیان لە زمانە لاوازو نەناسراوەکەی خۆیان کرد. سەیر دەکەین تا سەرەتای ۱۸۰۰ زایینیش، هەموو بەڵگەنامەکانی عوسمانی بە زمانی فارسی نووسراون. زمانی عەرەبیش زمانی وتاردان و فتوای ئاینی و نووسینی دەقە ئاینییەکان بوو.

## زمان و دەوڵەت

نزیکەی لای هەموو کەس بۆتە شتێکی چاوەڕوانکراو کە دەوڵەت (هەردەوڵەتێك) خاوەنی زمانی دیوانی خۆیەتی. لە راستیدا دیاردەی زمانی دیوانی دەوڵەت، لە سەردەمی تاوسەندنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی و دروستبوونی سنووری نەتەوەیی، لە سەدەکانی ۱۷، ۱۸ زایینی، لە ئەوروپا هاتە کایەوە. پێش ئەو کاتە، زمان ئەو رۆڵە ناوەندیە گرنگەی نەبوو. ئێستاش دەوڵەت زۆرن کە خاوەنی پتر لە زمانێکی دیوانین. لە دەوڵەتی خوارووی ئەفریقادا یازدە زمانی دیوانی دانیان پیانراوە. نموونەی تری لەمجۆرە زۆرن. ئەگەر چاو بە مێژوودا بخشێنین، دەبینین میللەتان و دەوڵەتانی زۆر هەبوون، کە دەستەبەرداری زمانی زگماکی خۆیان بوون بەقازانجی زمانێکی تر. دیارە هۆکاری جیاوازو جۆراو جۆریش بۆ هەر بارێك لەو بارانە هەبووە. ئارامیەکانی بیابانی شام لە ماوەیەکی پێوانەییدا، بە قازانجی عەرەبی، دەستەبەرداری زمانی ئارامی بوون، قیبتیەکانی میسر، تەنیا لە سێرمۆنییە ئاینییەکانیاندا، زمانی زگماك بەکاردێنن و هەروەها، باری لەمجۆرە لەم سەردەمەشماندا هەیە. زۆرینەی خەڵکی ولاتی مەغریب لەگەلی ئەمازیغی (بەربەر) بەلام وەکو نەریت، هەمیشە زمانی ئاین کە زمانی عەرەبیە، زمانی فێربوون وخوێندن و دیوانی بووە. ئایرلەندییەکان، چیتر بە زمانی زگماکی خۆیان (ئیریش) پابەندنین و بە گشتی بە قازانجی زمانی ئینگلیزی. دەستەبەرداری بوون. فلامانەکانی بەلجیکا بۆ ماوەی پتر لە ۲۰۰ ساڵ فەرەنسیان وەکو زمانی دیوانی هەڵبژارد، تا لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا پەشیمان بوونەوە.

پەیوەندی نێوان زمان و دەوڵەت لە سێ سەدەی رابردوودا پەیوەندیەکی هەمە لایەنەو ئاڵۆز بووە. دەوڵەت بۆ داسەپاندنی دەسەلات و بەگەڕخستنی ئامرازەکانی، پێویستی بە زمانی لێکتر گەیشتنی گشتی هەبوو. لە زۆربەی جاراندا، زاراوەی ئەو شوێنەی ناوەندی

دەسەلاتی تێدا چڕ بۆتەوە، ئەو رۆڵەی پێدەدرا. دەسەلات بە هەموو ئامرازەکانی خۆی پشتگیری لە زمانی دیوانی (خۆی) دەکرد و زۆر جاریش بە بەکارهێنانی زۆر و شێوازی تری نادروست دەکەوتە داسەپاندنی. رۆڵی زمان و زاراوەکانی تر کە لە ناو سنوردا قسەیان پێدەکرا، فەرامۆش دەکران و دەسڕانەوە. لە زۆر لەو ولاتانەی کە لای ئێمە بە ولاتی یەك زمانە ناسراون، تا ئێستاش چەندان زمان قسەیان پێدەکرێ هەروەك لە فەرەنساو ئیسپانیاو بریتانیای مەزن و سوید و تاد. . . ئەو زمانانەی لە سنووری دەولەتێکدا نەکران بە زمانی دیوانی، بە زمانی کەمینەکان ناو دەبرێن، زمانی بێ دەولەت، بێ کۆمەك و پالپشت و پشتگیری دەهێلرێنەوە. هاوکات زمانی دیوانی، بە کۆمەکی دەزگاکانی دەولەت و هەندێ جاریش بە زۆری دادەسەپێندرێ و تەنگ بە زمانی بێ دەولەت هەلدەچنێ و لە مەیدان وەدەری دەنێ. زمانی کوردی بە گشتی لە بارێکی نزیك لەمجۆرەی سەرەوە خۆی دەبینێتەوە.

بە دوو زمانە کردنی هاوولاتیانی دەولەتێك، دیاردەیەکی زۆر لە مێژ نییە. هەر لە کۆنەوە مرۆڤ پێویستی بە فێربوونی زمانێکی بێگانە بووە بۆ مەبەستی جۆراو جۆر. زۆر جار سێرمۆنیی ئاینی لە پەرستگاکاندا بە زمانێکی بێگانە بووە وەك عەرەبی بۆ موسلمانان و لاتینی بۆ کاتۆلیکان، مەندانی (ئارامیی رۆژهەلات) بۆ سابینە مەندائیەکان و تاد. . . هەروەها بازرگانی، کاری وەرگێڕی، کاری دیپلوماسی و نوێنەرایەتی کەچی لەم سەردەمەدا بە دووزمانەکردنی خەلك نزیکەی لە هەموو شوێنێکدا بۆتە ئامانجێکی دەولەت. زۆر دەولەت زمانی ئینگلیزی وەکو زمانی دووەمی فێرکردن هەلدەبژێرن بە هۆی بەرفراوانی ئەو زمانە و بەکارهێنانی بەربلاوی لە بوارەکانی زانستی، رامیاری و بازرگانیدا. لە سوید، دەولەت بودجەیەکی یەکجار زۆری تەرخانکردووە بۆ فێرکردنی زمانی ئینگلیزی. ئێستا دەکرێ بلێین کە هاوولاتی سویدی دوو زمانەن چونکە بەشی هەرە زۆری خەلکی، جگە لە زمانی زگماك، زمانی ئینگلیزیش دەزانن.

لە پەیوەندی نێوان دەولەت و زماندا، رووبەرووی روداوی سەرنجراکێشیش دەبینەوە، بۆ نموونە هەندێ جار زمانێك، بە دروست بوونی دەولەتی نەتەوەیی، ستاتوسی زمان وەردەگرێ. نەرویج نموونەیەکی دیاری ئەو دیاردەیەیە. تاسەدەی هەژدەیەم زمانێك لە گۆڕێ نەبوو بە ناوی زمانی نەرویجی. زاراوەکانی نەرویج، کە زۆر لە زمانی سویدی

نزیکن، به بەشێکی زمانی دانمارکی دادەندران. نەرویجیش بەشێك بوو لە وڵاتی دانمارك. دیارە زمانی سویدیش تا سەدەی ۱۳ زاینی هەر بە دانمارکی دەژمێردرا. لە شەڕی واترلو لەگەڵ ناپلیۆندا، دانمارکیەکان دایانە پاڵ فرەنسا. فرەنسییەکان شکان. دانمارك سزا دراو نەرویجی لێکرایەوەو خرایە سەر سوید. سویدیەکان ئەمەیان ناو لێنا یەکیەتیی سویدو نەرویج. بزوتنەوەی سەربەخۆیی و نەتەوەیی نەرویجی، لەو کاتانەدا سەری هەڵدا. لە پاڵ خەبات بۆ سەربەخۆیی، کاری رۆشنبیرییش پەرەی سەند. ژمارەیەك نەرویجی لایان وابوو، زمانی شاری ئوسلۆ و شارەکانی تری باشوور، پاك نییە و پڕیەتی لە وشە سویدی و دانمارکی. بۆیە رویان لەو گوندە ماسیگرە دابڕاوانە کرد کە بە پەرتو بڵاوی لە باکوور بوون. دوای کارێکی زۆر، توانیان زمانێکی پوخت کۆبکەنەوە. دواتر کەوتنە کردنەوەی خوێندنگا بە زمانی پەتی، کەچی خەڵکی شارە گەورەکانی باشوور، ئامادە نەبوون دەستبەرداری ئەو زمانە بن کە پێی راهاتبوون و پێیان دەخوێند. نەرویجیەکان دوای ئەوەی لە سوید جیابوونەوە (۱۹۰۳ زاینی) توشی راستیەکی تاڵ هاتن. لە لایەکەوە دەوڵەتی تازە خاوەن زمانە و نابن بە دەوڵەتی بێزمان، لە لاکەی تریشەوە، لایەنگرانی تازەو کۆن لەسەر هەڵویستی خۆیان سوورن. ئەمڕۆ لە نەرویج دوو زمانی دیوانی هەیە. زمانی (نەرویجی نوێ) و (زمانی نووسین، یان بوك مۆڵ). کۆمارە تازەکانی ناو یەکێتیی سۆڤیەتی پێشوو، جۆرێکی تر لە پەیوەندی نێوان دەوڵەت و زمانمان نیشان دەدەن. زمانی رووسی لە سەردەمی دەسەڵاتی قەیسەریەوە بە شێنەیی و دواتر لە سەردەمی کۆمۆنیستەکان (۱۹۱۷– ۱۹۹۱) زاینی، باشتر پلانی بۆ دارێژرا، توانیبووی بنکۆڵی زمانی زگماکی کۆمارەکان بکات. لە هەر چواردە کۆمارەکەی تر جگە لە رووسیا دەبوو بە دیوانی بە زمانی رووسی بگوترێ زمانی زگماکی یان نیشتیمانیی دووەم (فتارۆی رادنۆی یازیك) بەڵام ئەوەی من دیم رێك پێچەوانە بوو، رووسی لە هەموو شوێنێکدا وەکو زمانی لێکترتێگەیشتن کاری پێدەکرا. سیستەمی خوێندنیش پشکی شێری بە رووسی بوو. لە شانزە ساڵی رابردوودا هەموو کۆمارەکان زۆر بەشێنەیی خەریکی بوژاندنەوەی زمانی زگماکن تا دووبارە ببێتەوە بە زمانی دەوڵەت.

لەو خوێندنگا ئامادەیەی شاری ستۆکهۆڵم کە من وانەی تێدادەڵێمەوە، هەموو ساڵ ژمارەیەك خوێنکاری کۆمارەکانی پێشوی یەکێتیی سۆڤیەت هێشتا وەردەگیرێن، کە لە دوای روخانی یەکێتیی سۆڤیەتەوە چوونەتەبەر خوێندن. کەچی بە زمانی رووسی

دەدوێن و فەرهەنگی زمانی سویدی – رووسی بەکاردێنن سێ هۆکاری زۆر گرینگ بوژاندنەوەی زمانی زگماکی سست کردووە یەکەمیان هەژاریی زۆربەی ئەو ولاّتانەیە کە ناتوانن بودجەی پێویست بۆ گۆڕینی کتێبەکانی خوێندن دابین بکەن. رووسەکانیش بۆ رێگری لەمە، بەردەوامن لە چاپکردن و ناردنی بەخۆڕایی کتێبی خوێندن بە زمانی رووسی بۆیان. دووەم زمانی رووسی رەگی قوولتر لەوە داکوتاوە کە پێشبینی دەکرا. زۆربەی خەلّك ئەوەندە بە رووسی ئاشنان بەلایانەوە ئاسان نییە بگەڕێنەوە سەر زمانێکی تر. سێیەم بوونی ژمارەیەکی زۆری رووس لەو کۆمارانە کە وەکو هەوێنی زیندوراگرتنی رووسی، کار دەکەن و زۆر چالاکیشن. لە ولاّتەکانی بەلّتیکدا، رووسەکان بۆ پاراستنی ستاتوسی زمانی رووسی، تارادەی خوێن رژاندنیش چوونە پێش. دیارە دەولّەتی رووسیاش، لە هەموو ئاستەکان و بە هەموو شێوەیەکی ئابووری، دیپلۆماسی و تارادەی هەڕەشەش پشتگیریان لە هاوولاّتیانی رووسی ئەو کۆمارانە کردو هێشتاش دەیکەن .

لە زۆربەی ولاّتانی تازە پێگەیشتودا بە تایبەت لە خوارووی ئەمەریکا و ئەفریقیا (باشووری بیابانی گەورە) کێشەی زمان لەوە ئالۆزتربوو تا (دەولّەت) بە قازانجی زمانە زگماکەکان چارەسەری بکات، بۆیە زمانی کۆلۆنیالیزم کراوە بە زمانی دەولّەت و دامودەزگاکانی بەڕێوەبردن. دیارە بەم کارەیان کێشەکەیان چارەسەر نەکردووە، تەنیا توانیویانە ئەم کێشە ناسکەی زمان و نەتەوە بۆ دوارۆژ هەلّبگرن بۆ ئەوەی باشتر لەمە بگەین هیندستان وەك نموونە دەهێنینەوە. لە ولاّتی هیندستان سەدان زمانی جۆراو جۆر هەن و (بەهارات) سەرەڕای ئەوەش کە گەورەترین زمانەو خاوەنی کۆنترین بەلّگەی نووسراوە لەناو خێزانە زمانەکانی هیندۆئەورووپییدا کەچی ناکرێ بە زۆر بسەپێندرێتە سەر ئەو کەسانەی بە زمانەکانی تر دەدوێن. هەرکەس شانازی بە زمانی خۆیەوە دەکات چ بچووك بێت یاخود گەورە. جگە لەوە لە سەردەمی کۆلۆنیالیزمدا. زمانی ئینگلیزی تاکە زمانی خوێندن و بەڕێوەبردن بوو. بۆیە ئینگلیزی دوای سەربەخۆییش (١٩٤٧زاینی). پێگەی خۆی پاراست. سەرەڕای ئەوەش تەنیا دوو لەسەدی خەلّکی هیندستان زمانی ئینگلیزی دەزانن. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە زمانی ئینگلیزی زۆر لەوە دوورترە تاوەکو زمانی ئەلتەرناتیڤ جێگای خۆی کردبێتەوە. بەمەش دەردەکەوێ کە کێشەی زمان لەو ولاّتە چارەسەر نەکراوەو ئەو رۆژەدێت کە ئەم کێشەیە سەرهەلّبداتەوە.

له وڵاتانی تری خوار بیابانی گەورەی ئەفریقاش بارەکە لە جۆری باری هندستان دایە، تەنیا لە ئەمەریکای ناوەڕاست و خواروودا هەردوو زمانی ئیسپانی و پورتوگالی. توانیویانە بۆڕ بە زمانە خۆماڵییەکان بدەن و توشی پاشەکشەی مەرگباریان بکەن.

**بە مردنی زمانێك کولتوورێکی دەگمەنی مرۆڤایەتی دەمرێ.** هەر زمانێك چ بچووك بێت یاخود گەورە. هەڵگری کولتووری تایبەت و ناوازەی ئاخێوەرانییەتی. ئەو کولتوورەی لەناواخنی زمانێکداخۆی دەنوێنێ، بەری هەوڵ وکۆشش و ئەزموون و شێوازی ژیانی هەزاران ساڵەو نەوە لە دوای نەوەی ئەو زمانەیە. هەرگیز ناکرێت، هەموو وردە کاریەکانی کولتوور و دابونەریت و شێوە ژیانی قەتیسبووی ناو زمانێك وەکو خۆی رابگوازرێ و بپارێزرێ بەبێ پاراستن و زیندو هێشتنەوەی زمانەکە و بوونی هەمیشەیی ئاخێوەرانی. ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەو شەش هەزار زمانەی کە ئەمڕۆ لە سەر زەوی ئێمە قسەیان پێدەکرێ، هەڕەشەی نەمان و لەناوچوونیان لەسەرە ئەو زمانانەی کە لە نیشتیمانی خۆیاندا بوونەتە زمانی کەمینەو چیتر وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی ئاخێوەرانی نین، ئاخێوەرانیشی نەوە لەدوای نەوە پشتی تێدەکەن وازی لێدێنن. زۆرجاران گەلانی باڵادەست و سەردەستە، لە جیاتی کۆمەك پێکردن و پاراستنی ئەو فەرهەنگ و زمانانە نەخشەی لەناوبردنیان دادەنێن..

ئەنترۆپۆلۆجەکان، مێژوونووسان و کۆمەڵناسان هەڵپەیانە و شەڕ لەگەڵ کات دەکەن تا بەشێك لە کولتووری زمانە هەڕەشەلێکراوەکان تۆماربکەن و بیانپارێزن.

بە لەناوچوونی هەر زمانێك، مرۆڤایەتی زیانێکی گەورەی لێدەکەوێت کە هەرگیز قەرەبوناکێتەوە. باچیرۆکێکی زیندوو زۆر تازەی سەرئەنجام تراجیدی زمانێکتان بۆ بگێڕمەوە. کاتێ کە خریکی نووسینی بەشەکانی ئەو کتێبەبووم، یان وردتر بڵێم رۆژی ٢١/ ی کانونی دووەمی ئەمساڵ ٢٠٠٨، جیهان زمانێکی تری تا ئەو رۆژە زیندوی لەدەست چوو ئەو رۆژە (ماریاسمیپ جۆنێس) لە تەمەنی ٨٩ساڵیدا کۆچی دوایی کرد ماریا دواکەسی سەرگۆی زەوی بوو کە دەیتوانی بە زمانی (ئێیاك) بدوێت. زمانی ئێیاك سەربە خێزانی زمانی (نا-دێنی)یەو یەکێ بوو لەو زمانە زۆرانەی کە خەڵکی بنەڕەتی و بومی ئالاسکا قسەیان پێدەکرد. ماریا هەرگیز بە پێویستی نەزانی تا منداڵەکانی خۆی فێری ئێیاك بکات، چونکە زمانەکە زۆر لەوە زوتر لە رووی کۆمەڵایەتیەوە پەکی خرابوو. ماریا لە کۆتایی تەمەنیدا زۆر زۆر پەشیمان بوەوەو هەوڵی زۆریدا تا زمانەکەی

بە زیندویی لە دوای مەرگی خۆی بەجێبهێڵێ. هەر بۆ ئەو مەبەستە فەرهەنگێکی بۆ زمانی ئێیاك نووسی لەگەڵ کتێبێکی تر لەسەر رێزمانی ئێیاك. ئەو دوویادگاریە تاقانەیەی ماریا ئێستا لە بەشی زمانەکانی زانکۆی ئالاسکا سوودیان لێوەردەگیرێ، بەڵام ئیدی ناکرێ وردەکاریەکانی فەرهەنگ و دابوونەریتی ئاخێوەرانی ئێیاك پێشانی کەس بدرێت. ئەو فەرهەنگە لەگەڵ تابوتی ماریا بە خاك سپێردرا.

## II
## گەشتێکی مێژوویی لەگەڵ زمان بە میسۆپۆتامیادا

سەرەتاکانی ساڵانی نەوەدو یەکەم رۆژی خوێندنی وانەی مێژووم بوو لە شاری ستۆکهۆلم ئێمە (٣٥ ) خوێندکار بووین. مامۆستاکە ویستی ئاستی شارەزایمان لە مێژوو بزانێ، بۆیە پرسی کێ دەزانی مێژوو لە کەیەوە دەستی پێکردووە سەرەتا چەند وەڵامێکی زۆر هەڵەی وەرگرت تا نۆرە گەیشە من و پێم وت مێژوو لەوکاتەوە دەستی پێکرد ک، مرۆڤ فێربوو بنووسێ، یان کە مرۆڤ نوسینی داهێنا. هەرچی پێش ئەمە رویداوە پێی دەڵێن رووداوەکانی پێش مێژوو ئەو کاتە مامۆستاکە رووی لەمن کردو پێی وتم کەواتە لەوانەیە بشزانی مێژوو لە کوێ دەستی پێکرد؟ منیش وتم لە شوێنێکی نزیك ماڵەکەی من. پرسی ماڵی تۆ لە کوێیە؟ گوتم لە شارێکی میسۆپۆتامیا رووی لە خوێندکارەکان کردو وتی بەڵێ راست دەڵێ مێژوو لە نزیك ماڵی ئەوان دەستی پێکردووە. وەك دەزانین مێژوو بە تۆمارکردنی دەقی زمان دەستی پێکرد. بەڵگە نامە مێژوویەکان هێما بۆ شارستانییەتی سۆمەری دەکەن کە بەرلە ( ٥٥٠٠ ) ساڵ پێش ئێستا یەکەمین دەقی نووسراویان لە مێژووی مرۆڤایەتی تۆمار کردووە. تەمەنی نووسراوە ئیلامیەکانیش نەختێ دوایی نووسراوی سۆمەری دەستی پێکرد. داستانی گلگامێش کە (٤٠٠٠ ) ساڵ پێش ئێستا بە سۆمەری تۆمار کراوە کۆنترین دەقێکی مێژوویە کە تا ئێستا مرۆڤ پەی پێ بردبێ. بایەخی داستانەکە هەر لە کۆنییەکەیەوە نایەت. بە پێزی ناوەڕۆکەکەیو شێوازی دارشتنەکەی هەزاران ساڵە مرۆڤ سەرسام دەکات. لە گۆشەو کەناری میسۆپۆتامیادا تا ئێستا چەندان دەقی ئەم داستانە بە زمانی سۆمەری یان وەرگێڕاوی داستانەکە بە ئەکەدی دۆزراوەتەوە. مێژووناسان پەتای ئەفلەوەنزای داستانی گلگامێشیان لە چەندان دەقی ناسراوی تری مێژوویدا دۆزیوەتەوە، لەو کتێبانەی کەراستەوخۆ یان ناراستەوخۆ شتیان لەم داستانە راگواستووە دەتوانین ناوی ئەم شاکارانە بەرین: هەرسێ کتێبە ئاسمانییەکان. تەورات و ئینجیل و قورائان، ئۆدیسا، ئیلیادە و هەزارو یەك شەوە. شارە سۆمەرییەکان (ئور، ئۆما، لەگەش، کیش و ئۆروك)، نزیکەی (١١٣٠ ) ساڵێك دوای داهێنانی نووسینیش بەسەربەخۆیی مانەوە. لە ئەنجامی

شەڕی نێوان شارە سۆمەرییەکان، بوار بۆ تیرەیەکی نیوەدورگەی عەرەب خۆش بوو تابێنە ناوچەکە. ئەکەدییەکان سالّی (٢٣٧١ ) پێش زاین کۆتاییان بە سەربەخۆی شارە سۆمەرییەکان هێنا. بە فراوانبوونی دەسەلاتی ئەکەدی و تیرەکانی تری نیوە دورگە، کە دواتر هاتنە ناوچەکە. زمانەکەشیان بەرەبەرە بلاّبووەوە. زمانی سۆمەری تا درەنگ وەکو زمانی وێژەو پەرستگە توانی شوێنی خۆی بپارێزێ. لە سەردەمی بوژانەوەی شاری بابلدا زمانی ئەکەدی گەیشتە چلەپۆپەی، لە رێگای تابلۆ قوڕینەکانەوە، بەشێك لە ژیانی فەرهەنگی و دابوونەریتی بابلییەکان بۆ مرۆڤایەتی روونبۆتەوە دەقە دەستوورییەکەی حامورابی (١٧٩٣- ١٧٥١پ. ز)، ناسراوترین دەقێکی زمانی ئەکەدییە بۆمان ماوەتەوە. هاوکات لەگەڵ نیشتەجێبوونی ئەکەدییەکان لەو پەڕی باشووری میسۆپۆتامیادا، تیرە هیندۆئەوروپییەکان بە چەندان شەپۆل روویان لە باکووری میسۆپۆتامیا کردو لەگەڵ گەل و هۆزە بومیەکانی وەك: (گۆتی، کاسی) تێکەلاّو بوون. شەپۆلەکانی هیتی و مانناو میتانی و ئالانەکان و هیتریش، زەمینەیان خۆش کرد بۆ دروستبوونی ئیمپراتۆریای میدی. بەداخەوە تا ئێستا تابلۆ و دەقی نووسراوی ئەوتۆ، کە بۆ سەردەمی دەسەلاتی میدیەکان بگەڕێتەوە، دەست نەکەوتوون. وەك دەزانرێ لە سەردەمی بوژانەوەی دەسەلاتی میدیەکەندا و لە ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی پێش زاین زەردەشت بەخۆیی و پەیامە ئایینییەکەیەوە سەردەردێنێ. نووسراوی زەردەشت کە بە (ئاوێستا) ناسراوەو تا ئێستاش ٨٣٠٠٠ وشەی ماوەتەوە، بە زمانی ئەوکات نووسراوە. ئەگەر وایدابنێین کە ئیمپراتۆریای میدی ئالاّ هەلگری ئاینی زەردەشتی بووە ئەوا بێ گومان ئەو دەسەلاتە دەخرێتە ناو ئەو ئیمپراتۆریانەی کە خاوەن پەیامی زمان بوون.

چەندان سالّ بەرلەوەی میدییەکان لە سالّی (٦١٢پ. ز) شاری نەینەوا بگرن و دوا قەلاّی زمانی ئەکەدی لە باکوور بڕوخێنن، زمانی ئارامی لەوێ جێگای بە زمانی ئەکەدی لەق کردبوو. ئارامییەکان کە نیشتەجێی مێرگەکانی بیابانی شام بوون، خەریکی بازرگانی بوون. پیشەکەیان، پێویستی بە داهێنانی شێوازێکی ئاسانی نووسین دەکرد. ئەمانە لە جیاتی هێمای مێخی ئالۆز، بۆ یەکەم جار زمانی خۆیان بەپیت نووسییەوە. ئەم کارە وەك شۆڕشێکی رۆشنبیریی گەورە لە هەموو رۆژهەلاّتەوە باوەشی بۆ کرایەوە. سەرکردەکانی لەشکر بینیان کە پەیامەکانیان چەندە کورتترە و پوختەتر و

خێراتر بە ناوچە دوورە دەستەکان دەگات. بازرگانانیش بە هەمان شێوە بە ئاسانی دەیانتوانی سات و سەودایان تۆمار بکەن. زۆری نەبرد ئارامی چووە ناو کۆشکی پاشا و مالّی نووسەران و دیوەخانی پێغەمبەر و پیاوچاکانیش. هەمووان دەیان ویست تا ئەوپەڕی سوود لەو زمانەو شێوازە جادوکەریە بۆ نووسین وەربگرن. بەم جۆرە ئارامی لە سەدەی شەشەمەوە کۆتای بە رۆلّی زمانی ئەکەدی هێنا.

زمانی ئارامی لە ماوەیەکی کورتدا بوو بە زمانی لە یەکتر گەیشتنی گشتی لە هەموو رۆژهەلاّتدا، بەم جۆرە ئارامی یەکەمین زمانە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا وەکو زمانێکی نێو نەتەوەیی سوودی لێ وەرگیراوە. بایەخی زمانی ئارامی و رۆلّی ئەو زمانە، پتر لە ١٢٠٠ سالّی خایاند. لە هەندێ قۆناغی کورت زمانەکە تووشی پاشەکشێی کاتی دەبوو. بۆ نموونە لە سەردەمی هێلینیدا، زمانی گرێکی، لە بوارەکانی دیبلۆماتی و بازرگانیدا رۆلّی رێبەری کەوتەدەست، بەلاّم گرێکی نەیتوانی جێ بە ئارامی لەق بکات و لە مەیدانی بەکارهێنان لای بات، تێبینی کراوە کە سەردارانی مادیش بە ئارامی نامەیان لەگەلّ یەکتر ئالوگۆڕ کردووە. هەخامەنشییان رێنووسێکی لە ئارامی وەرگیراویان لەگەلّ خۆیان بردە هیندستان. لە سالّی ١٩٠٩ زاینیدا قەبالّەیەکی فرۆشتنی رەز، لە هەورامان دۆزراوەتەوە کە دانەیەکی بەرێنووسی ئارامی نووسراوەتەوە. لە سەردەمی ساسانیاندا زمانی ئارامی، زمانی رۆشنبیریی گشتی بوو. پاشای ساسانیان بەهرامی پێنجەم ٢٧١- ٢٧٥زاینی کاتێك کە لەگەلّ (مانی) داهێنەری ئاینی مانی دوا، هەردوو لا زمانی هاوبەشیان ئارامی بوو. گەرچی هیچ کامێکیان بە رەگەز ئارامی نەبوون. عیسای مەسیح لە ناسیرە جگە لە ئارامی، کە زمانی زگماکی بوو، بە هیچ زمانێکی تر نەدەدوا. بەهۆی بلاّوبوونەوەی خێرای ئاینی مەسیحی لە رۆژهەلاّتدا، زاراوەی سریانی زمانی ئارامی، هەرزوو بوو بە زمانی پیرۆزی ئەم ئاینە. یەکەم گورزی گوشندە کە بەر زمانی ئارامی کەوت لە سەدەی چوارەمی زاینی بوو. لەو سەدەیەدا کلّێسای مەسیحی توشی چەندان لێکترازان بوو. ئەمانە وایان کرد کە ناوەندی بریاردەری ئاینی لە رۆژهەلاّتەوە بۆ باشووری ئەوروپا (کوستەنتنییە و رۆم) بگوازرێتەوە. زمانی یۆنانی و زمانی لاتینیش لە جیاتی (سریانی، ئارامی) بوو بە زمانی پیرۆزی ئاینی. تەنیا مەسیحییەکانی رۆژهەلاّت بوون کە هێشتا دەستیان بە ئارامییەوە گرتبوو. دواهەمین و کوشندەترین پاشەکشەی زمانی ئارامی و زاراوەکانی لە دوای سەدەی

حەوتەمەوە بوو. کاتێك کە زمانی عەرەبی تەنگی پێهەڵچنی. زمانی عەرەبی، کە زمانی پیرۆزی ئاینی ئیسلام بوو، نەك هەرپاشەکشەی بە زمانی ئارامی کرد، بەڵکو ختیە مەترسی لەناوچوونیشەوە. زاراوەکانی ئارامی تا ئێستاش لە چەند شوێنێکی کوردستان و وڵاتانی دەوروبەر، بە شێوەیەکی بەرتەسك بەکاردێن. بەڵام پیتی عەرەبی لە ئارامی وەرگیراو، هێدی هێدی بوو بە رێنووسی چەندان زمان.

نەخشەی زمان لە میسۆپۆتامیا لە سەرەتای سەدەی شەشەمی زاینیدا، واتا بەر لە شەپۆلی کۆچی عەرەبان بۆ ناوچەکە، بۆمان دەردەخا کەنا سەقامگیرییەکی گەورەی پێوە دیاربوو. ناوچەکە هەمووی لەژێر رکێفی ئیمپراتۆریای ساسانیدا بوو. باکووری رۆژهەڵاتی میسۆپۆتامیا یان مەیدانی شەڕو شۆڕبوو لەگەڵ رۆمیان، یان دەستاو دەستی پێدەکرا. زمانی سەردەمی میدی و هەخامەنشی، هەروەکو زمانی ئەکەدی بە پەلاماری ئەسکەندەری مەکدۆنی (٣٣١پ. ز) توشی پاشەکشەیەکی گورچکبڕ ببوو. ساسانییەکان ساڵی ٢٢٦ زاینی لەسەرتەختی دەسەڵاتی ناوچەیەك دانیشتن کە لە رووی زمان و ئاینەوە بێسەروبەریەکی گەورەی پێوەدیار بوو. ٤١٦ساڵ دەسەڵات نەیتوانی وڵاتێکی خاوەن پەیامی یەك ئاین و یەك زمان دروست بکات. دانیشتوانی هەر هەرێمێك بە زاراوەی خۆیان دەدوان، کە هەر بەناوە جیۆگرافیەکەی دەناسرا دانیشتوانی پارس بە پارسی، میدیا بە میدی، تەبەرستان بە تەبەری. سوغدستان بە سوغدی و بەم شێوەیە خوارزمی، تەخاری، سکای و هیتریش ناویان هاتووە. زمانی پایتەخت (تەیسەفون) کە خەریك بوو وەکو زمانی دیوانی دەسەڵات خۆی بناسێنێ پێی دەگوترا (پەهلەوی) یان پالەوی و فەهلەوی، کە ئێستاش ئێمە بۆ کوردانی فەیلی بەکاری دەبەین. شێوازی نووسینیش هەروەکو زمان لە قەیرانی قۆڵدابوو. زمانی نووسینی هەرە بڵاوی ئارامی زاراوەی سریانی بوو. زۆر جار خوێنەر دەبوو دەقێك بێدەنگ بە ئارامی بخوێنێتەوە و دەمودەست ناوەڕۆکەکەشی بە پەهلەوی بڵێتەوە. بەم شێوەیە دەگوترا (پەهلەوی هوزوارەش). هەروەها (٢٥)پیت لە زمانی ئارامی وەرگیرابوو بۆ نووسینی پەهلەوی. هەرپیتێك چەند نیشانەیەکی بۆ داندرابوو. هەرنیشانەیەکیش ژمارەیەك دەنگی هەبوو. بەم جۆرە خوێنەر دەبوو نزیکەی ١٠٠٠دەنگی ناسیباوە تابتوانێ دەقێك بخوێنێتەوە. شێوازی تریش هەبوون بەڵام جێی خۆیان نەگرتبوو وەکو شێوازی لە ئارامی وەرگیراوی

(پازەند)، ڕێنووسی کۆنی ئاوێستایی و ئەو ڕێنووسەی کەمانی بۆ نووسینی نووسراوەکانی خۆی بەکاری دێنان.

پاشاگەردانی هەر بواری زمانی نەگرتەوە. کیسرا خەسرەوی پەرویز (٥٩٠-٦٢٨) زاینی، ساڵی ٦٠٣ زاینی بە هەڵی زانی و پەلاماری ئیمپراتۆریای بێزەنتی دا. ئەم شەڕەی ساسانیان، بوو بە درێژترین و خوێناویترین شەڕی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. تا مەرگی خەسرەو لە ساڵی (٦٢٨) زاینی، بەردەوام بوو. ئەمە هەمان شەڕە کە لە سەرەتای سووڕەتی ئەلروم لە قورئاندا باسکراوە لەم ٢٥ساڵەی شەڕدا، ساسانییەکان نەپەرژانە سەر هیچ شیرازەی کاروباری خۆیان و فەرمانڕەواییان تێکچوو. تەنیا لە نێوان (٦٢٨-٦٣٦) زاینیدا واتا لە هەشت ساڵدا یازدەکەس بوون بە فەرمانڕەوا (نۆپاشاو دووشاژن). ئەو ساڵەی کە عومەری کوڕی خەتاب (٦٣٤-٦٤٤) زاینی لەشکری پێکەوەنا بۆ پەلاماردانی ساسانیان، واتا ساڵی (٦٣٤) زاینی، پێنج شاو شاژن لە تەیسەفون ئاڵوگۆڕیان پێکرا. لەکاتی پەلاماری عەرەباندا یەزدگوردی سێیەم (٦٣٤-٦٤٢) زاینی، فەرمانڕەوای گرتەدەست کە لە دایکێکی کۆیلەی پێست ڕەش بوو.

زمانی عەرەبی بە پێدزەو خشکەیی نەهێندرا ناوچەکە، بە ئاشتیش باوەشی بۆنەکرابووەوە. زمانەکە، دوای شەڕی خوێناوی، بەسەر ناوچەکەدا داسەپێندرا. ئەوانەی داوای دادپەروەری و پرەنسیپی وەکیەکیان دەکرد، لە لایەن کاربەدەستانی عەرەبەوە ناونرابوون (شعوبی) و بە توندی سەرکوت و بێدەنگ دەکران. ئەوانەش کە ملکەچی دەسەڵاتی عەرەب بوون، ناویان لێنرابوو (موالی).

زمانی عەرەبی لە ماوەیەکی بە هەموو پێوانەیەك کورتدا توانی دەشتی شام، میسرو بەشێکی زۆری باکووری ئەفریقا بکات بە پێگەی خۆی، تەنانەت لە جیاتی زمانی ئارامی لە شام و قیبتی لە میسرو ئەمازیگی (بەربەری) لە باکووری ئەفریقا، عەرەبی توانی ببێ بە زمانی زگماکی زۆرینەی خەڵك. ئەوەی جێگای سەرنجە عەرەبی تەنیا لە باشووری میسۆپۆتامیا خۆی داکوتا. ئەم زمانە هەرگیز نەیتوانی لە قوڵایی ئیمپراتۆری پێشوی ساسانیدا، جێپێی خۆی قایم بکات.

## زمانی پارسی، زمانی بەرگری

چیرۆکی لەدایکبوونی زمانی فارسی، بەشێکی دانەبڕاوە لە چیرۆکی بەرگری لەخۆکردن دژی دەسەڵاتی هەناسە پڕوکێنی عەرەبان، لە سەدەکانی شەش و حەوت و هەشتی زایندا. نەتەوە پەرستانی (ئێرانی) گەلێك جار هەوڵیانداوە، کۆنی زمانی فارسی بسەلمێنن، بەڵام بە دۆزینەوەی دێڕێك لێرەو دێڕێك لەوێش، فارسی هەرگیز لەسەدەی هەشتی زاینی کۆنتر نییە. بۆ ئەوەی وردتر لە پرۆسەی پێکهاتنی زمانی فارسی بگەین. دەبێ نەختێ بۆ دواوە بگەڕێینەوە. پێش پەلاماری عەرەبان بۆ سەر وڵاتی ساسانی، هەروەکو لە بەشەکانی پێشوتر هێمامان بۆ کردووە. زمانێکی یەکگرتوو لە وڵات نەبوو. زمانی تیسفوونی پایتەخت (پەهلەوی) یان فەهلەوی بوو لە تیسفوونی جاران و بەغدای ئێستا بەکاری دەهات. هەرێمەکانی تریش هەریەکەو شێوەزاری خۆی هەبووە.

هەردوو هەرێمی ماد و پارس هەمیشە دوو شوێنی زۆر ستراتیج و گرنگی دەسەڵات بوو جگە لەمەش خانەدانی ساسانی لە کوردانی هەرێمی پارس بوون ئەگەر چی ئەمڕۆ ئیدی چیتر دانیشتوانی نوستانی پارس یان (فارس) کوردنین، بەڵام مێژوو نووسانی زوو، لە باسی خەڵکی پارسدا بە کورد ناویان بردوون. (استخری) جیۆگرافیزانی گەورە، لە ساڵی (٣٤٠)ی کۆچی نووسیوویەتی (بنەماڵەی کورد لە پارس ئەوەندە زۆرن کە لە ژماردن نایەن). (ابن حوقل) لە ساڵی (٣٦٧)ی کۆچی نووسیوویەتی (کوردانی پارس لەسەر زەوی پارس پتر لە ١٠٠ تیرەن. من سی و هەندێکم ناو بردووە خەسرەوی، شاکانی، ستامیهری، ئازەرکانی بەنداد میهری، رامانی، میهرکی، شاهۆیی. . . . ) تا دوایی. (مقدیسی) لە ساڵی (٣٧٥)ی کۆچی، لە کتێبی (احسن التقاسم فی معرفە الاقالیم)دا نووسیوویەتی (سی و سێ خێڵی کورد لە پارسن کە ٥٠٠ بنەماڵەن) (ابن بلخی) لە کتێبی (فارسنامە)دا نووسیوویەتی (شانو شەوکەتی لە شکری فارس کە هەیە لە کوردانەوەیە). (یاقوتی حەمەوی) لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا، ناوی شاروچکەیەکی لە کتێبەکەی خۆیدا بە (کورد) تۆمار کردووە کە کەوتبووە ناوچەی بەیزای فارسەوە.

## خوراسان، پەناگەی کوردانی پارس و لانکی زمانی پارسی

بەشی باشووری میسۆپۆتامیاو هەرێمی پارس، دوو شوێنی نزیك و هاوسنووری عەرەبستان بوون. تیرە عەرەبەکان، لەگەڵ یەکەم سەرکەوتنیان، کەوتنە خۆ بۆ

نیشتەجێبوونی یەکجاری لەو دوو هەرێمە بە پیتە. تازەهاتوان، جگە لەوەی ببوونە خاوەنی کەنیزەك و تالآنی ئەرپیشیان بەرکەوتبوو، هێشتا پێویستیان بە پارەی مفت هەبوو تا مشەخۆرانە بژین. کاربەدەستان کەوتنە روتاندنەوەی خەڵك. هەر بۆ نموونە خەڵکی شاری (دینەوەر یان ناچار کرد کە عەرەبی شاری تازە دروستکراوی کوفە بژیێنن. ناویشیان لە دینەوەر نا (ماە کوفە) یان (مادکوفە). بە هەمان شێوەش عەرەبی شاری تازە دروستکراوی بەسرا بە پارەی خەڵکی (نەهاوەند) دەژیان و بە شارەکەشیان دەگوت (ماە بەسرا). هانی خەڵکیشیان دەدا تا لە سەر ئاینی خۆیان بمێننەوە و نەبنە موسوڵمان تاکو (جزیە) یان لێبسەنن. تەنانەت (حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی) کەوتە بە کارهێنانی زۆرو هەڕەشە، کاتێ کە خەڵکێکی زۆر لە ترسی (جزیە) دان بوونە موسوڵمان. کوردانی پارس جاران خۆیان بە بەشێك لە دەسەڵات دادەنا. وەك دەزانین خانەدانی ساسانی لە کوردانی ئەو هەرێمە بوون، ئەوان لە لایەکەوە دەسەڵاتیان لە دەست چووبوو، لە لاکەی ترەوە ژیان و خاك و بژێوی و ئاین و باوەڕیشیان کەوتبووە بەر مەترسی، هەر بۆیەشە خەڵکی ئەو هەرێمە لە هەموو یاخیبوون و هەڵمەت و راپەرینەکانی دەورو بەریاندا بەشداربوون.

بەرەنجامی ئەوانەش، زۆرتربوونی گوشار بوو لە سەر یان. وەك بەرەنجامی ئەمەش، خەڵکێکی زۆر سەری خۆی هەڵگرت. ناوچەی خوراسان لە ناوەندی دەسەڵاتی عەرەبان دوور بوو، بۆ یەشە دەسەڵاتیان لەوێ کزبوو.

بۆ سەلماندنی. باشتری ئەمە، دەتوانین لای هەندێ لە مێژوونووسانی کۆن، سۆراغی کوردانی پارس لە خوراسان و دەوروبەری بکەین. (ابن خلکان) لە کتێبی (وفیات ألاعیان)دا سەرنجی ئێمە بۆ ژمارەیەکی زۆری خێل و تیرەی کورد لە خوراسان رادەکێشێ، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا. (ابن خلکان) بە زمانێکی روون دەنووسێ (ئەبو موسلیمی خوراسان لەو دەستانەیە و لەناو کوردان سەری هەڵداو راپەڕی. . . ). وەك دەزاندرێ، ئەبو موسلیم سالّی ٧٥٠ زاینی، لەسەر زێی بادینان پەلاماری لەشکری ئەمەویەکانی داو تێکیشکاندن و دوایی بە دەسەڵاتیان هێنا. لە کتێبی (مێژووی سیستان)، کە لە سالّی (١٠٣٠) زاینی نووسراوە، هاتووە (بە هۆی زۆر بوونی کوردان لە سیستان، یعقوب لیث صفاری، میرێکی بە ناوی عبدالرحیم خارجی، بۆ رێکخستنی کارو باری ئەوان دامەزراند، ئەوانە کوردانی پارس بوون کە یارمەتی یەعقوبیان دا، لە

دژی دەستدرێژییەکانی خەلیفەی عەباسی). لە سەردەمی ئێستاشدا. نزیکەی (٢) ملیۆن کورد لە باکووری خوراسان (قوچان و شیروان) دەژین. هەندێ لە مێژوونووسانی هاوچەرخ، بوونی کوردانی خوراسان بۆ سەردەمی شا عەباسی سەفەوی (١٥٨٧-١٦٢٨) زاینی دەگێڕنەوە. هەندێکیان لایان وایە شا ئەم کوردانەی بۆ خوراسان راگواستووە. هەندێکی تریش لایان وایە کە ئەو کوردانە لایەنگرو جیرەخۆری شا بوون و بۆ پاراستنی سنووری باکووری خوراسان ناردراونەتە ئەوێ. ئەگەر بەلگەش لە بەردەستدا بێت کە شا عەباس هەندێ هۆز و تیرەی کوردی بۆ خوراسان راگواستووە، ئەوا هێشتا هەلەیەکی گەورەیە باوەڕبکەین مێژووی بوونی کوردان لە خوراسان، لە سەردەمی سەفەویەکانەوە دەست پێ دەکات. تەیموری لەنگ (١٣٧٠ – ١٤٠٥ زاینی) پتر لە ٢٠٠ سال پێش شا عەباس و، ١٠٠ سالیش پێش دروستبوونی دەولەتی سەفەویەکان، بە شاری (قوچان) دا تێپەریوە. تەیمور لە بەهاری سالی (٧٧٩)ی کۆچی بۆ پەلاماری (سەبزەوار) بەناو قوچاندا تێدەپەڕێ. ئەو لە یادداشتەکەیدا نووسیویەتی. . . (من کاتێ گەیشتمە قوچان، پیاوانی ئەوێم دیت، بالابەرزو پەیکەر توندو تۆل بوون. ئەوان هێشتا کەپەنکیان لە بەردابوو، چونکە هەوای بەهاران لە قوچان ساردە. هەریەکێ لەوان دارێکی لە دەست بوو. هەندێ جار گۆپالەکانیان دەخستە سەر شانیان. ئەوان وا پێنەدەچوو پەلاماری لەشکرەکەم بدەن)، بەلام لە تێروانینیشیاندا بۆمان دیار بوو کە لێمان ناترسن. هەندێ لەوان چاویان کال و مویان زەرد بوو **بە زمانێك دەدوان کە نە فارسی و نە عەرەبی بوو. دەرکەوت کە کوردن لە کوردستان کۆچیان کردووەو لە قوچان نیشتەجێبوون.** چونکە **پیاوانی کورد** بەهێزو بە توانا بوون، من هەندێکیانم بانگ کرد و بە هاوکاری دیلماج قسەم لەگەل کردن و پرسیم ئایا حەزدەکەن بێنە ناو لەشکری من. ئەوان پرسیان تۆ کێی؟ گوتم من تەیمورم، سولتانی (ماوراء النهر)م و بەم زوانەش دەبمە سولتانی خوراسان. **کوردەکان گوتیان ئێمە نامانەوێ لە ژن و مندال و ولاتی خۆمان دوور بکەوینەوە. . . ).**

گەر سەرنج بدەین دەبینین، کوردانی قوچان بە شوێنەکەیان دەلێن **(ولاتی خۆمان )** ئاخۆ مرۆڤ دەبێ چەند پشت لە شوێنێك بژیێ تا بە ولات و نیشتیمانی خۆی بزانێ؟

بەم جۆرە، بە هۆی دووره دەستی ناوچەی خوراسان، ناوچەکە دەبێتە مەکۆی نارازیان، جگە لە کوردانی پارس، خەلکی تریش روو لەوێ دەکەن.

ئەوەی لێرەدا جێی بایەخە، نیشتەجێبوونی ژمارەیەکی زۆری عەرەب بوو لە خوراسان، کە دواتر تێکەڵ بە ژیانی رۆشنبیری و رامیاریی ناوچەکە بوون. عەرەبەکان لە هەموو خوراسان دەبینران، بەڵام شاری (توس) مۆڵگەی سەرەکیان بوو. کەمێ درەنگتر لەو سەردەمەی کە جێ باسی ئێمەیە، تەیموری لەنگ سەرنجمان بۆ بوونی عەرەب لە خوراسان رادەکێشێ و دەنووسێ (. . کوری من شێخ عومەر، کە لەگەڵ من هاتبووە توس، دوای هاتنە ناوشار، چونکە دیتبووی کە خەڵك بە زمانی عەرەبی دەدوێن و هەموشیان دەستاریان لە سەرە، وتی مەگەر ئێرە حیجازە کە خەڵك جامانەی لە سەر ناوەو بە عەرەبی قسە دەکەن. . . (تا تەیمور بە کورەکەی دەڵێ): زمانی عەرەبی کە تۆ لەم شارەدا گوێت لێدەبێ، لە پاشماوەی سەردەمی دەسەڵاتی عەرەبانەوەیە لە سەر خوراسان. لە توس تێکرای خەڵك بە زمانی عەرەبی دەدوێن بەڵام هەڵبژاردەو زانایان بە فارسی قسە دەکەن).

تا ئەمرۆش رەگەزی عەرەب لە شاری توس بوونی خۆی پاراستوە. (ئەسەدوڵڵا عەلەم) کە سەردەمێك وەزیری دەرباری دوا شای ئێران بوو، شێخی هۆزێکی عەرەبی توسە. هەموو ئەو گەل و نەتەوەو تیرەو هۆزانەی روویان لە خوراسان کرد بوو، شان بە شانی خەڵکی بومی ئەوێ، بەرچاویان روون بوو. بۆ روخانی دەسەڵاتی زاڵی عەرەبان (لە هەندێ کاتدا دەسەڵاتی عەرەبی ئەمەوی)، خەباتیان دەکرد. لە هەندێ قۆناغدا، جاری سەربەخۆیش دراوە وەك دروستکردنی حکومەتی سەفاریەکان لە سیستان لە نێوان ساڵانی (٨٦٨ تا ٩٠٨) زاینی و سامانییەکان لە ئەفغانستانی ئەمرۆ و خوراسان لە نێوان ساڵانی (٨٧٤ تا ٩٩٩) زاینی.

ئا لەو سەردەمانەدا بوو کە بزوتنەوەی رۆشنبیریش تاوی سەندو وەکو چەکێکی بەرگری هاتە مەیدانەوە. هەر ئەو کاتە، واتا لە سەدەی هەشتەمی زاینیدا، بۆ یەکەمین جار نووسین بە خوارەزمی و دەری دەستی پێکرد. کوردانی پارس لەو پرۆسە رامیاری و رۆشنبیرییەی خوراسان، چالاکانە بەشداریان کردو، هەمووان بەیەکەوە کەوتنە گەشەپێدانی سەرەتای نووسین بە دەری. عەرەبی خوراسان، هەر وەکو کوردانی پارس چالاك بوون. زمانی دەری بە خێرایی فۆرمی خۆی وەرگرت. کوردانی پارس بۆ هەتا هەتایە جێپەنجەی خۆیان بەسەر زمانەکە هێشتەوە، چونکە هەر چەندە ئەو زمانە لە خوراسان پێك هات بەڵام بە ناوی زمانی پارس ناوبانگی دەرکرد. عەرەبی خوراسانیش،

بە تێکەڵاو کردنی هەزاران وشەی پێویست لە زمانی خۆیان، بەشداربوون لە بنیاتنانی زمانی بەرگری. ئەوانەی لایان وایە زمانی فارسی لە سەرەتاوە کاریگەری عەرەبی لەسەر نەبووە، هەڵەن. زمانی عەرەبی، لە ڕێگای عەرەبی خوراسانەوە، هەر لە سەرەتاوە بەشداربوو، لە بنیاتنانی زمانی فارسی، هەر وەکو چۆن زمانی کوردیش، لە ڕێگای کوردانی نیشتەجێی خوراسان، لەو پرۆسەیە بەشدار بووە. بەم جۆرە زمانی فارسی بە ناوێتەکردنی عەرەبی، لەگەڵ زمانی دەری و خوارەزمی هاتە کایەوە، بەمەش دەتوانین بڵێین کە زمانی مۆدێرنی فارسی، زمانێکی دەسکردەو پێکهاتە سەرەکیەکانی بریتین لە عەرەبی، دەری و خوارەزمی. لەم سەردەمەشدا گەلێك وشە لە زمانە ئەورووپیەکان خزێندراونەتە ناو زمانەکەوە، تا وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی ڕۆژانەی ئاخێوەرانی بێت.

زۆر گرنگە هێما بەوەش بکەین کە ١٢٠٠ ساڵ پێش ئێستا، نەخشەی ئەتنی و ئاینی کوردستان و ئێران بەم جۆرەی ئێستا نەبووە. لە یەکچوون و تەبایی، بە تایبەت لە ڕووری ئاینییەوە، زۆر بەرچاو بووە. نزیکەی تێکڕای خەڵکی شارەکانی ئێران شافعی مەزهەب بوون. حمداللەی مستوفی، لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (نزهە القلوب) دیاری کردووە کە تەواوی شارە گەورەکانی وەك تەورێز و قەزوین و ئەسفەهان و شیراز، شافعی مەزهەب بوون. چەند سەد ساڵێك درەنگتریش، تەبایی ئاینی تێبینی دەکرێ. تەیمورلەنگ لەم بارەیەوە تێبینی کردووەو نووسیویەتی کە (بێ بۆنە نابێ گەر بڵێم ناوەندەکانی ئاینی شیعە بریتین لە خوراسان و ڕەی و کەنارەکانی دەریای ئابسکوون)، لە شوێنی تر شیعە نین مەگەر بە پەرش و بڵاوی). ئەو کەڵە نووسەرە گەورانەی بەرهەمیان بە فارسی بۆمان جێهێشتوە وەك، سەعدی شیرازی، حافز و خەیام و نیزامی گەنجەوی و هتد. . هیچیان شیعەمەزهەب نەبوون.

زمانی فارسی زۆر زوو لە لایەن هەموانەوە باوەشی بۆ کرایەوە. زۆری نەبرد بوو بە زمانی نێونەتەوەیی لە ڕۆژهەڵاتداو تەنانەت زمانی ڕۆشنبیریی گشتیش بوو هەر لە سنووری چین و هیندەوە تا ئاسیای بچووك. لە حوجرەکانی کوردستاندا فارسی بوو بە بەشێك لە سیستەمی فێرکردن. تا سەرەتای سەدەی بیستەمیش شوێنەواری خوێندنی فارسی تێبینی دەکرا. فارسی توانی بە سەرکەوتویی ئەو ڕۆڵە بگێڕێ کە بۆی بەدی هاتبوو. توانی هەڵکشانی زمانی عەرەبی ڕابگرێت، تەنانەت لە زۆرکاتدا جێگایشی بگرێتەوە.

شەپۆلە گەورەو یەك بە دوای یەکەکانی تورك، لە دوای (١٠٢٩ ) زاینی بۆ ناوچەکە، باری ئەتنی، زمانەوانی و ئاینی هەموو ناوچەکەی شێواند. هاتن و نیشتەجێبوونی تورکان لە کوردستان و ئێران و ئاسیای بچووك گەورەترین گۆڕان بوو لەو ناوچانە.

دوای ئەوەی شەپۆلی هۆزە تورکەکان، لە سەدەی دەیەم بۆ رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەستی پێکرد، نەخشەی زمان لە ناوچەکە بۆ هەتا هەتایە گۆڕانی بەسەر داهات. شەپۆلی یەك لە دوای یەکی تورك نزیکەی (٥٠٠) ساڵی خایاند و هەموو ناوچە بە پیتەکانی وڵاتی رۆم و کوردستان و ئازەربێجان و ئێران و زۆر شوێنی تریشی گرتەوە. سەلجوقی، غەز، تورکان، مەغۆل و دواتریش تەتەر هەموو ناوچەکەیان تەنی. هۆزە تورکەکان لە هەر کوێیەك نیشتەجێ دەبوون، بەیادی نیشتمانی کۆنیان، ناوی سەرجەم شارو دەشت و دێهات و شاخ و چیا و چۆم و رووبار و دار و بەرد و پەردویان دەگۆڕی. تورکان دوای میرنشینە جۆراو جۆرەکانی سەلجوقیان، چەندان دەوڵەتیان یەك لە دوای یەك لە ناوچەکە دامەزراند وەك: دەوڵەتی سەلجوقی گەورە (١٠٤٠ – ١١٦٣) زاینی. ئێلخانی (١٢٥٦ – ١٣٣٦ ) زاینی. جەلایەری (١٣٣٦ – ١٤١١ ) زاینی قەرە قۆینلۆ (١٣٨٠ – ١٤٦٨ ) زاینی. دەسەڵاتی تەیموری لەنگ (١٣٧٠ – ١٤٠٥ ) زاینی ئاق قوینلو(١٤٠٣ - ١٥٠٨) زاینی دەوڵەتی عوسمانی (١٣٠٠ – ١٩٢٤) زاینی، دەوڵەتی سەفەوی (١٥٠٢ – ١٧٣٦ ) زاینی. دەوڵەتی ئەفشاری (١٧٢٦ – ١٧٤٩ ) زاینی. دەوڵەتی قاجاری (١٧٩٤ – ١٩٢٥) زاینی. کۆماری تورکیا (١٩٢٣) زاینی. جگە لە مانە لە گۆشە و کەناری کوردستاندا، چەندان میرنشینی تورکی هاتنە کایەوە وەك: میرنشینی ساجی لە ئەردەوێل (٨٧٩ – ٩٣٠) زاینی. دانشمەندی لە سیواس و مەلاتیە (١٠٧١ -١١٣٧) زاینی. سلدقی لە ئەرزەرۆم (١٠٧١ – ١٢٠١) زاینی. مەنکوچەك لە ئەرزنجان و کمخ (١٠٧١ – ١٢٢٨) زاینی. سەکمانی قوتبی لە ئەخلات (١١٠٠ – ١٢٠٧) زاینی، ئەرتەقی لە ماردین(١٠٠٨ – ١٤٠٨ ) زاینی توغان ئەرسەلان لە بارزین و بدلیس و دوین (١١٢١ – ١١٤٨) زاینی، ئەتابەکیە زەنگیەکان لە موسڵ و هەولێر (١١٢٧ – ١٢٦٢) زاینی، قارەمانی لە قۆنییە (١٢٥٦ – ١٤٨٣) زاینی، زیقادری لە ئەلبستان و مەرەش و مەلاتیە (١٣٣٩ – ١٥١٥)، زاینی بەنی رەمەزان لە مەلاتیە(١٣٧٨ – ١٦٠٨) زاینی، بەنی بورهانەدین لە سیواس (١٣٨١ – ١٣٩٨) زاینی شوێنەواری مۆلگەی تورك تەنانەت لە شوێنە دوورە

دەستەکانیش هەستی پێدەکرێ. هەر بۆ نموونە ناوی بەشێك لە دێیەکانی دۆڵی جافەتی، ناوچەی سورداش، دواتر ناوچەی ئاغجەلەرو تا دوایی. تەنانەت شاخی (دابان)یش لە بنەڕەتدا ناوی شاخێکە کە تانێستاش لە سیبیریاو لە کلکەی خوارووی دەریاچەی بایکال بەو ناوە ماوە. شاخی هەیبەت سوڵتان، شوێنی کوێستانی تورکان بووەو زستانیشیان لە گوند یان بە زمانی خۆیان(کۆی) بردۆتە سەر کە ئەمڕۆ بۆتە شاری (کۆی)یە. کاتێ تورکەکان هاتنە ناوچەکە، زمانەکەیان زمانێکی زاری، بێ ئەلفوبێی، هەژاری، چەند هۆزێکی رەوەند بوو. هەر بۆیەشە کەوتنە ژێر کاریگەری زمانی فارسی. لە هەندێ شوێندا، توانیان خەڵکی بومی وەدەرنێن، یا خود ناچار بە ملکەچی و توانەوەیان بکەن، وەك لە ئازەربایجان و بە شێکی زۆری ئاسیای بچووك (تورکیا) دەیبینین. لە زۆر شوێنی تری کوردستانیشدا خۆیان لەناو خەڵکدا توانەوەو کۆمەڵێك ناویان بەیادگاری لێ بە جێماوە. یاخود هەندێ جێنشینگەی دوورو لێکدابڕاویان وەك دوورگە لێماوەتەوە. کاتێ کە دەسەڵاتی تورکان گەیشتبووە چلە بۆیەی خۆی لە سەدەی هەژدەیەمدا. بەشێکی گەورەی ئەورپاو ئاسیاو ئەفریقیا یان لە ژێر دەسەلات بوو، ئا لەو کاتەدا کەوتنە هەوڵی نووسینی زمانەکەیان. زمانی تورکی کە پێی نووسرا، وشە گەلێکی زۆری عەرەبی، فارسی و کوردی خزێندرایە ناو تا بتوانێ ئەرکەکانی بەجێ بگەیەنێت. ئەوکاتەی دەسەڵاتدارانی تورك وشیار بوونەوە، گەلانی ژێر دەستشیان وشیار ببوونەوە بۆیە، تورکی نەیتوانی ببێ بە زمانی دەسەڵات. گەورەترین گۆڕان کە بەسەر زمانی تورکیدا هات، ئەوا لە سەردەمی کۆماری تورکیادا بوو کاتێ کە بڕیاردرا زمانی تورکی بە پیتی لاتینی بنووسرێ و وشەی پێویستیشی لە زمانە ئەوروپیەکان وەربگرێ. بەم جۆرە زمانەکە هەم لە مێژووی دووسەد ساڵەی پێشوتری و هەم لە چوارچێوەی سروشتی خۆیشی دابڕێندرا، دوای ئەم گۆرانکارییە کاریگەری تورکی بەسەر دەوروبەردا تا ئەوپەری، کزو لاواز و سنوردار بوو. ئەگەر پەرەسەندن و بلاوبوونەوەی زمانی تورکی بەراورد بکەین بە رادەی بلاوبوونەوەو نیشتەجێبوونی هۆزە تورکەکان خۆیان، ئەوا بە روونی بۆمان دەردەکەوێت کە لاوازی زمانی تورکی، هۆیەکی گرنگی پاشەکشێ و توانەوەو قەتیسبوونی تورکان بوو لە بەشێکی زۆری ئەو رووبەرەی کە تێدایدا بلاوبوونەوە. هۆکارێکی تر، کە رۆڵی گرنگی هەبوو لە پاشەکشەو قەتیسبوونی زمانی تورکی، شەڕی ئاینی بوو لە نێوان تورك زمانەکان خۆیاندا. لە کۆتایی سەدەی ١٤ ی زاینی، کێشە و دووبەرەکی لە نێوان

تورکانی شیعه و تورکانی سونه دەستی پێکرد. واتا لە سەردەمی دەسەڵاتداریەکانی جەلایەری و قەرەقۆینلۆ، ئەم شەڕو کێشە مەزهەبیە سەدان ساڵی خایاند. لە سەردەمی تورکانی سەفەویی شیعە مەزهەب و تورکانی عوسمانی سوننی مەزهەبدا گەیشتە چلەپۆپە. سەفەویەکان خۆیان بەلای زمانی فارسیدا یەکلایی کردەوە، بەمەش کاریگەری زمانی تورکی لە ناوچەکانی ژێر دەستیاندا سنوودار بوو. تورکی سوننەی عوسمانی، درەنگانێك بوونە هەڵگری ناسنامەی نەتەوەیی تورکی و کەوتنە داسەپاندنی زمانەکەیان بەسەر گەلانی ژێر دەستیاندا، بەڵام لە بەختی ئەواندا، گەلانی، سنووری عوسمانیش وەك تورکان وشیار ببوونەوە، بۆیە سەرکەوتنێکی بەرچاویان بە دەست نەهێنا لە بە تورککردنی گەلانی تر. هاوکات مەزهەب گەلانی تورکی لە یەکتر دابڕی. هەڵکەوتەی جیۆگرافی کوردستانیش وەکو پوازێك، درزی ئەو لێکدابڕانەی جیهانی تورکی بەکراوەیی هێشتۆتەوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە تورکەکان، لەگەڵێك شوێندا زاڵ بوون و مانەوە وەك پێشتر هێمامان بۆ کرد. چیرۆکی زمانی کوردی لە میسۆپۆتامیا، هەندێ تایبەتمەندی خۆی هەیە. ئەو خاکەی ئەمڕۆ پێی دەڵێن کوردستان، بەر لە داهێنانی مێژوو، جێگای ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤ بووە. ناوچەکە پێگەی یەکێ لە شارستانییە هەرە کۆنەکانە، تیرە و هۆزی هیندۆئەورووپی وەك میتی،ماننا، میتانی، نالانی و میدی و هیتر لە دەوروبەری ٢٠٠٠ ساڵ پێش زاین بە چەندان شەپۆل هاتنە ناوچەکە و لەگەڵ کۆمەڵگا بومیەکان تێکەڵ بوون کە هەندێکیان کۆمەڵگای ناسراو بوون وەك: گۆتی، و کاسی. زاراوە جیاجیاکانی کوردی لە تێکەڵبوونی زمانی تیرە هیندۆئەورووپییەکان و زمانە ناوچەییەکانی خەڵکی بنەڕەت پێکهات. یەکێ لە تایبەتمەندیەکانی. زمانی کوردی ئەوەیە کە بە درێژایی تەمەنی زیاتر لە هەزار ساڵەی، هەرگیز نەبۆتە زمانی ستاندارد. لە چەند قۆناغێکی مێژوویدا، چەند زاراوەیەکی کوردی بەرەو ئەوە گەشەیان دەکرد تابێن بە زمانی دیوانی و لە یەکترگەیشتنی گشتی. وەك لە سەردەمی ساسانیاندا (٢٢٤ - ٦٤١) زاراوەی فەیلی یان پەهلەوی ئەو رۆڵەی بینی. لە سەدەی ١٥و نەختێ زوتریش زاراوەی گۆران بووە زمانی نوسین. گەشەی زاراوەی گۆران هاوکات بوو لەگەڵ بوژانەوەی بزوتنەوەی ئاینی یارسان (کاکەیی). دواتریش لە هەرێتی پەرەسەندنی میرنشینی ئەردەلاندا، ئەو زاراوەیە پەرەی سەند هاوکات لەگەڵ گۆرانی، لەو پەرِی باکووری کوردستانیش، زاراوەی کرمانجی پێینووسراو بلاٚبووەوە. کرمانجی تا ئاستێکی باش

گەشەی کردو بۆ یەکەمین جاریش رۆژنامەیەکی کوردی بەو زاراوەیە دەرچوو (١٨٩٨) زایینی. کرمانجی لەسەر دەستی کاربەدەستانی کۆماری تورکیا لە دوای (١٩٢٥) زایینی گورزی کوشندەی بەرکەوت. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، زاراوەی کوردی سلێمانی - موکریانی، لە دەربارى میرنشینی باباندا بوژایەوە. ئەم زاراوەیە تا ئێستا لە هەر زاراوەیەکی پێشتری کوردی پتر گەشەی سەندوەو پێی نووسراوە. دەکرێ بڵێین کە هەموو مەرجەکانی زمانی ستانداردی دابین کردووە. تایبەتمەندییەکی تری زاراوە کوردییەکان، کەمی کاریگەری زمانانی بێگانەیە لە سەریان. بەشی زۆری ئەم کەمی کاریگەرییە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە کوردستاندا دەسەڵاتێکی ناوەندی بە هێز نەبوو. تا پێویستی بە زمانێکی گەشەسەندوی بەڕێوەبەرایەتی هەبێ. هەروەها زمانی کوردی میراتگری راستەوخۆی فۆلکلۆری سەردەمانی کۆنی ساسانیان بوو، بە پێچەوانەی زمانی دەسکردی فارسی، کە چەند سەدەیەکی ویست تا بوو بە خاوەنی فۆلکلۆری ناوچەی جیا جیا. فۆلکلۆری دەوڵەمەندی کوردی لە شیعرو گۆرانی و پەندی پێشینان و قسەی نەستەق، وەك کوانویەك وابووە بۆ پاراستن و لە سەر پێ راگرتنی زمانی کوردی لە قۆناغە سەختەکاندا. واتا لە نێوان سەدەی پانزەیەم تاسەدەی بیستەم. ئەمە ئەو قۆناغەیە کە زمانی کوردی و بوونی نەتەوەیی کوردیش، کەوتبووە بەر هەڕەشەی هۆزە پەلاماردەرەکانی تورك. هەر وەکو چۆن ئەو کەسەی ئەمڕۆ بە ئینگلیزی دەدوێ، لەگەڵ ئەو کەسەی کە (١٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا بە ئینگلیزی دەدوا، بە دوو زمانی جیا دواون، ئاخێوەرانی زمانەکانی تریش، لە وانە کوردی، بەو گۆڕانە تێپەریون. خۆگۆڕینی زمانی کوردی لە زۆر زمانی تر خێراتر بووە. ئەگەر سەیری شیعری نووسراوی سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەمی هەموو زاراوەکانی کوردی بکەین، تەنانەت دەقی پەخشانی سەرەتای سەدەی بیستیش لەگەڵ نووسینی ئەمڕۆی کوردی بەراورد بکەین، دەگەینە ئەو راستیە کە نووسەرانی پێشوی کورد، هەر وەکو فارسی و تورکی نووسان، زمانەکەیان سیخناخ بوو بە وشەی بێگانە، کەچی ئەمڕۆ ئێمە بە کوردیەکی زۆر پەتی دەنووسین. پرۆسەی گۆڕانی زمانی کوردی لەو هەشتا ساڵەی دواییدا، بە ئەندازەی پرۆسەی گۆڕانی هەزار ساڵەی ئینگلیزی یان عەرەبیە. هەر بۆیەشە ئەوەی نوێ. گەر عەرەبی، فارسی و تورکی نەزانێ. بە سەختی لە دەقەکانی سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم دەکات.

# III
## ئیتمۆلۆجیای هەندێ وشەی زمانی کوردی

ئیتمۆلۆجیا(Etymology)، یان لێکدانەوەی وشەو، دۆزینەوەی رەگی مێژوویی هەر وشەیەك، زانستێکی گەشە کردوو بەرفراوان و هەمەلایەنەیە. لە رێگای لێکدانەوەی وشەوە، زۆر راستی مێژوویمان بۆ روون دەبێتەوە کە رەنگە بە رێگاکانی تر کارێکی ئەستەم و نامەیسەر بێت.

میللەتان، لە رێگای دامودەزگای ئەکادیمی و زمانەوانییەوە، هەمیشە خەریکی لێکدانەوەو دۆزینەوەی واتاو بنەرەتی، وشە بە وشەی زمانەکانی خۆیانن.

ئەکادیمیای سویدی، هەرچەند سالێك و جارێك، بە فەرهەنگی زمانی سویدیدا دەچێتەوە. ئەگەر هەڵەیەك لە لێکدانەوەکانی زووترياندا بوبێت، ئەوا لە چاپی تازەدا، راستی دەکەنەوە. بۆچوونی تازە دەخەنە سەر لێکدانەوەکانی تر. هەر وشەیەك لە زمانی سویدیدا، چەند هەڵبگرێت، ئەمەندە لێکدانەوەی لەسەر دەکرێت. لە ماڵپەری ئەکادیمیای سویدیدا، بە دوای وشەی (یول، yul. ) دەگەرام، چونکە گومانم هەیە وشەکە لە (یەلدا)وە وەرگیرابێت. تەنیا لە سەر ئەم وشەیە ئەکادیمیا پتر لە ٦٠ لاپەرەی فۆلسکاپ، نووسراوی هەیە.

زانستی لێکدانەوەی وشە لە زمانی کوردی، بە ئەندازەی پێویست بایەخی پێنەدراوە. دیارە نابێ هەوڵی تاکە کەسی هەردوو نووسەری گەورە: تۆفیق وەهبی و مەسعود محەمەد، لە بەرچاو نەگرین کە لێکۆڵینەوەیان لە سەر سەدان وشەی کوردی بۆ ئێمە جێهێشتووە، هەروەها دکتۆر جەمال رەشیدیش لە نووسینەکانیدا، لە گەڵێك وشەی کۆڵیوەتەوە کە جێی بایەخی زۆرن. جگە لەمانە من تەنیا هەوڵی تاکو تەرام بینیوە.

ئەم وشانەی لێرە لێکۆڵینەوەیان لە سەر کراوە، دەبوو بە گوێرەی ریزبەندی پیتەکانی ئەلفوبێی کوردی، ریز بکرانایە، کەچی من وام نەکردو، هەندێ لە وشەکان جۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندیە لە کاتی خوێندنەوە لە

بەرچاو بێت، من ئەم وشانەم لە دوای یەك دانان. وشەکانی تر کە ماونەتەوە، بێ ڕەچاوکردنی هیچ سیستەمێك تێکهەڵکێشی ناو وشەکانی تر کراون.

**بت**/ لە زمانی کوردی، بەو پەیکەرە دادەنرێ کە لە شێوەی خودا یان یەکێ لە خوداکان، دروستکراوە و، لە هەندێ کۆمەڵگادا وەکو خودا سەیری دەکرێ و کرنوشی بۆ دەبردرێ. وشەی بت لە زمانی کوردی، ڕەگی بۆ چەند هەزار ساڵێك دەگەڕێتەوە. بەر لە بڵاوبوونەوەی ئاینی میترایی (خۆرپەرستی) لە کوردستاندا، خەڵکی ئەو وڵاتە، ناوێکی تریان بۆ (خودا) هەبوو. وشەی (بت) پاشماوەی گۆڕاوی ئەو ناوەیە. کوردان، یان ڕاستر بڵێین ئەو، هۆز و تیرە هیندۆئەورووپییانەی کوردستان، کە دواتر لە پێکهێنانی ڕوخساری نەتەوەیی گەلی کورد بەشداربوون، هاوکات لەگەڵ ژمارەیەك گەل و تیرە و هۆزی تری هیندۆئەورووپی، بەر لە لێکبڵاوبوونەوەو کۆچکردنیان بۆ کوردستان، خودایان ناسیوە، ئەو هۆزانە، ناوێکی هاوبەشیان بۆ خودا هەبووە، کە پێی دەگوترا. بۆگ، بوغ یان بوغ. تا ئێستاش بە زمانە سلاڤیەکان ( ڕووسی، پۆلۆنی، بولگاری، سربی و هتد) بە خودا دەگوترێت بۆگ. میترایی، سەرەڕای بڵاوبوونەوەی بەربڵاوی، کەچی نەیتوانی شوێن بە خودای کۆن (بوغ) لەق بکات، شوێنەواری بوغ تا ئێستاش بە شێوەی جۆراو جۆرو لە هەموو شوێنێکی کوردستان دەبینرێت دواتر هێما بۆ هەندێکیان دەکەین،* ئەم بەشە بەرکولێکی بچووکە لە کتێبێکی فراوانتر لەسەر ئیتمۆلۆجیا کە بەم زوانە دەردەچێت.

بۆ ئەوەی لە پرۆسەی گۆڕانی بوغ بگەین، دەبێ نەختێ بۆ دواوە بگەڕێینەوە. (ئەلبەیرونی) مێژوونووس لە (اثار الباقیة)دا نووسیویەتی کە خەڵکی ناوچەی (سەغەد) بە میهریان دەگوت (قەغکان)، هەروەها لە (خوارەزم) یش، (فیغ) یان پێدەگوت، قەغکان و فیغ کە تا هاتنی ئیسلامیش، بۆ خودای میترابیان (میهر) بەکار هاتوون، هەر هەمان بوغن. ساڵنامەی هەرە کۆنی ئاریایی بە مانگی (بغیادیش) دەستی پێدەکرد، کە هەمان مانگی (میهر)ی ئاوێستاییە. کاتێ ئاینی زەردەشتی بڵاببووەوە، زەردەشتیان ویستیان خۆرپەرستان بۆلای ئاینی تازە ڕابکێشن، بۆیە ریزیان لە میهر یان میترا ناو ڕۆڵی ناو بژیکەریان پێدا لە نێوان ئاهورامەزادو ئەهریمەن. هاوکات ئەوان مۆری نا خودایان لە هەموو خوداکانی تر داو، کردیانن بە ئەهریمەن و دێو و درنج. دوای سەرکەوتنی ئاینی تازە، ئیدی بوغ و لایەنگرانی، دەبوغزرێن و بە ریسوایی سەیر دەکرێن. ناوی خوداکەشیان بوغ، بۆ هەمیشە مۆری نا خودایی لێدەدرێت. بوغ بە

تێپەڕبوونی کات دەبێ بە، بوغت، بوت و بت. هەروەها دەبێتە خودایەکی، ناڕاست و نـــــــــــاڕەوا و نەشـــــــــــیاو بــــــــــــــۆ پەرســــــــــــتن.
پاشماوەی بوغ لە زمانی کوردیدا، هەر بت نییە. بوغ یان خودای ئەو سەردەمیش، وەك خودای ئەم سەردەمە، پێویستی بە پەرستگا هەبووە، تا باوەڕداران، بۆ بەجێگەیاندنی دابونەریتی پەرستن، لێی کۆببنەوە، پەرستگاکانی بوغ یەکپارچە دارو درەخت و گوڵ و گوڵزارو سەوز بووە. کەواتە جێگای سەر سوورمان نییە، گەر ئێمە ئێستاش جێگایەکی ئاوا پڕ لە دارو درەخت و گوڵو گوڵزار و چیمەن ببینین، پێی بڵێین **(باغ)** کە لە (بوغ)ەوە هاتووە، ناوی هەندێ شوێنیش، ئەوە دەگەیەنن، کە دەبێ ئەو شوێنانە پەرستگای ناسراوی (بوغ) بووبن، وەك **(بەغداد)** کە لە (بوغ دادە) وە هاتووە. یان شاری **(بۆکان)** کە بریتی بووە لە **(بوغ + کان)**. دەتوانین چەندان ناوی تری لەمجۆرە لە گۆشەو کەناری کوردستان بدۆزینەوە وەك **(بۆگد)**. وشەی بۆگدار کە لە شێوەی بەغداد بۆمان ماوەتەوە، جاران وەکو ناوی تاکی کەسیش لە کوردستان بەکارهاتووە. بە گۆڕانی ئاین و پەیدابوونی کولتوور و زمانی تازە لە ناوچەکەدا، ناوەکەش بە هەمان واتا و بەو زمانە بەکارهاتووە، بە گونجاندنی لەگەڵ ئاینی تازە. بۆ نموونە هەمان ناوی بۆگداد بۆتە: خودابەخش، خوداداد و عطاالله والله وێردی، کە هەموو یان هاو واتان لەگەڵ بۆگداد. وشەی (غەفور)ی زمانی عەرەبیش لە (فیغ + فەڕ) وەرگیراوە کە دەکاتە فەڕی خودا و وەك پێشتر هێمامان بۆ کردو، تا سەردەمی (ئەلبەیرونی)یش (فیغ) لە جیاتی بۆگ یان ناوی خودا بەکارهاتووە. غەفور وەکو سیفاتی خودا، لە ئاینی ئیسلام شوێنی بۆتەوە.

**بەختیار**/ ناوێکی کوڕانەیە، بە واتای دڵخۆش، بەخت باش و لە ژیان سەرکەوتوو بەکاردێت، بەختیار بە یەکێ لە ناوە هەرە کۆنەکان دەژمێردرێ و تەمەنی لە چەند هەزار ساڵێك پترە. بەختیار لە دوو وشەی لێکدراو پێك دێت. بەشی یەکەمی ناوەکە بریتیە لە (بەخت) کە لە زمانی کوردیدا بە واتای (شانس) بە فراوانی بەکار دێت. وشەی بەخت، لە بنەڕەتدا ناوی خودای کۆن و دێرینی گەلانی ئاری (بوغ)ە کە بۆتە بوغت، بوخت و بەخت. پاشگری (یار)یش بە واتای یارمەتیدەر و کۆمەك دێت. بەم جۆرە بەختیار بە واتای خودای بوغ یار و یارمەتیدەرت بێت. یاخود بە واتا گۆڕاوەکەی بەکار دێت، کە بەخت و شانس یار و یارمەتیدەرت بێت.

**فەڕ/** وشەی (فەڕ) بە واتای (پیرۆز) لە زمانی کوردیدا بەکار دێت. ئەم وشەیە ڕەگی ئایینیی کۆنی هەیە لە زمانی سۆمەری (فەڕ ) بەکار هاتووە.

لە دەق و دابونەریتەکانی ئاینی زەردەشتیدا، بە چەند شێوەیەك، توشی وشەی (فەڕ) دەبین. گرنگترینیان دیاردەی (فەروەشی)یە، کە بوونەوەرێکی ئاسمانین و ڕۆڵی پاسەوانیان پێدراوە. وشەی فەروەشی لە زمانی کوردیدا بە هەڵە بۆ فریشتە بەکار دەبرێت.

**فەڕوەشتە/** فەریشتە و دواتر بۆ فریشتە گۆڕاوە. لە ئاینی زەردەشتیدا فریشتە پێی دەگوترا (**فەڕ وەهر**) کە واتای (**فەڕهێن**) دەدات. وشەی (فەڕ) بەدرێژایی ڕۆژگار بۆتە بەشێك لە پێکهاتەی چەند ناوێك وەك (**فەڕاوەرت**) کە یەکێك بووە لە پاشا بەناوبانگەکانی دەوڵەتی ماد و باوکی پاشای بەناوبانگ (کەیخوسرەو)بوو. فەڕاوەرت واتای فەڕ ئاوەردە کە دەبێتە فەڕی هێنا، هەروەها ناوی فەرهاد لە فەڕ وەگیراوە و لە بنەڕتدا فەڕهات و فەڕ هاورت بووە تا بۆ فەرهاد گۆڕاوە.

**مفەڕك/** مفەرك لە یادەوەری خەڵکدا، شتێکە لە کەسێکی پیرۆز و خوداپەرستەوە هاتووە، یان کەسێکی پیرۆز و خوداپەرست ئەو شتەی بەکارهێناوە و دەستی لێداوە، یاخود نزای لەسەر خوێندوە، شتی مفەڕك هێز و توانای کەسە پیرۆزەکەی هەیەو دەتوانێ یارمەتی هەڵگری شتە مفەڕکەکە بدات. وشەکە خۆی لە بنەڕەتدا لە (فەڕ)ەوە هاتووە کە پەیوەندی بە ئاین و باوەڕی زەردەشتیەوە هەیە مفەڕك بە شێوەی (مبارك) کەوتۆتە ناو زمانی عەرەبیش. هەروەها هەردوو وشەی (فەرزەند) و (فەرامورز)یش وەکو دوو وشەی سەربەخۆ دەخرێنە دوای (مفەڕك).

وشەی مێژوویی و ئاینی (فەڕ)، هێشتا چالاکانە، بە چەندان واتای جۆراو جۆری دی، لە زمانی کوردیدا بەکار دێت. لەوانە (بەدفەڕ) کە کەسێکە فەڕو چاکەو پیرۆزی لێ بەدوورەو هەمیشە کاری خراپ دەکات، یان بەدکارە. هەروەها (بێفەڕ) کەسێکە کە بێسوود و بێکەڵکە. گومانی زۆرم هەیە کە وشەی (خێر) ی عەرەبیش لە بنەڕەتدا لە (فەڕ)ی زەردەشتی وەرگیرابێت، دواتر وەکو چەندان وشەی تری لەمجۆرە، بە بەرگێکی تازەی ئاینییەوە بۆ مان ناردرابێتەوە.

**فەرزەند/** لە زمانی کوردیدا، بە واتای کوڕ یان نەوەی نێرینە بەکار دێت. وشەکە لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە، بەم شێوەیە: فەڕ + زەند. زەند واتا باسك یان دەست.

بەم جۆرە وشـەی فەرزەنـد بەسـەر یەکـەوە دەبـێ بـە (بـازوی بەفـەڕ) یـان (دەسـتی بـە بەرەکەت). ئەم دەربڕینە بۆ کۆمەڵگای لادێنـشین دەگەڕێتـەوە لـە لادێ، لەبـەر ئـیش و کاری زۆر و قورس، پێویستی بە دەستی کاری زۆر هەبووە، بۆیە کـاتێ کـە بنەماڵەیـەك یان خێزانێك، کوڕێکیان دەبوو، ئەوا دەستی فەڕو کار پتر دەبوو

**فەراموزز/ فەراموزز**، وەکو ناوی کەسی تاکی نێر، تا ئێستاش لە گەرمیان و هەنـدێ شوێنی خوارووی کوردستان باوە. وشەکە رەگی ناوی ئاینی هەیە و بۆ سـەردەمی ئـاینی زەردەشتی دەگەڕێتەوە. فەراموزز لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە بـەم جۆرە؟ فـەڕ + هورمز کە واتاکەی (فەڕی خودا) دەگەیەنێ. یان هورمس یان ئـاهورامزدا، نـاوی خـودا بـووە لـە ئـاینی زەردەشـتیدا. ئـەم نـاوە دوای بڵاوبوونـەوە ی ئیـسلام، بـە شـێوە ئیـسلامیەکەشی بـەکارهاتووە و هێـشتاش هەربـەکار دێـت. شـێوەی ئیـسلامی ناوەکـە بریتیە لە (خواکەرەم)

**پەروەردەگار/** بە واتـای (خـودا) لـە زمـانی کوردیـدا بـەکار دێـت. ئـەم وشـەیە لـە دابوونەریتی ئاینی زەردەشتیەوە بۆمان ماوەتەوە، جـاران سـاڵێك بەسـەر دوازدە مـانگ دابەشکرابوو. هەرمانگێکیش سی رۆژ بوو. سەرجەم رۆژەکانی ساڵ دەبوو بە سێ سـەدو شێست رۆژ. بۆ پڕکردنەوەی ساڵ (٥) رۆژ دەخـرا سـەر سـاڵ ئـەو پێـنج رۆژە راسـتەوخۆ دەکەوتە پێش نەورۆز و پێی دەگوترا (پێنجە). خەڵك لەو بـاوەڕدا بـوون کـە لـەو رۆژەدا گیانی مردوانیان (فەڕ رەوانان) سەردانی ماڵەکانی خۆیـان دەکـەن. لـەو رۆژانـەدا دەبـوو هەموو ئەندامانی خێزان لەگەڵ یەك تەبا بان، دەنا گیانی مـردوان سـەردانی نـەدەکردن. خەڵك بەو سـەردانەیان دەگـوت (فـەڕ وەردەگـان یـان پـەروەردەگان) کـە واتـای ( فـەڕ و پیرۆزی هێنەران دەگەیەنێ).

**رۆح/** وشەی (رۆح) بەم شێوەیەی ئێستای، لە زمانی عەرەبیەوە هاتۆتـە نـاو زمـانی کوردی. وشەکە عەرەبی نییەو ئەوانیش وەریان گرتووەو لەگەڵ گـۆکردنی زمـانی خۆیـان گونجاندویانە. وشەکە لە فەهلەوی یان زمانی دیوانی ساسانیاندا هـەبووە و ئێـستاش بـە (شێوەیەك) تەنیا لە زمانی کوردیدا ماوەتەوە. رۆح لە (رەو)، یان بـە شـێوەی، کـۆ، لـە (رەوان) وەرگیراوە. رەوان لە جیاتی رۆح، لـە بـارێکی تەسـکدا تـا ئـەمرۆش لـە زمـانی کوردیدا بەکار دێت. هەموومـان گوێمان لێبووە، لـە پرسـەی مردوانـدا دەگـوترێ گیـانی

ڕەوانــی بــە **بەهەشــت شــاد بێــت یــان ڕۆحــی ڕەوانم**. فارســەکان وشــەی ڕەوانیــان دووبارەخستۆتەوە ناو زمانی خۆیان بەڵام بە واتای (دەروون) بەکاری دێنن.

**خۆر**/ بە واتای ڕۆژ یان ئافتاو یان هەتاو، لە زمانی کوردیدا بە کاردێت. خۆر هەمیشە سەرچاوەیەکی سەرسوورهێنەری ڕوناکی و وزە بووە بۆ مرۆڤ. دوای ئەوەی هۆز و تیرە هیندۆئەوروپییەکان لە وڵاتی میسۆپۆتامیا نیشتەجێبوون، لای خەڵکی بومی و بنەڕەتی ناوچەکە، جۆرێك لە ڕیزی خودایان بۆ خۆر دیت، هەر وەك لە شارستانییەتی سۆمەرییەکانیشدا، ئەمە دەبینرا. گەلانی هیندۆئەوروپی پێش ئەوکاتە خودای ( بوغ) یان دەپەرست، وەك لە سەرچاوە کۆنەکانی سانکریتی و لای گەلە سلاڤەکان و پاشماوەی ناوی شوێناندا ماوە. بۆیە دەبێ خۆرپەرستی لە دوای کۆچکردنیان بۆ کوردستان، فۆرمی خۆی وەرگرتبێ. ئاینی خۆرپەرستی بەرە بەرە بەو هێمای ڕیزلێنانە ناسرا کە بۆ خۆر بەکاردەهات لە شێوەی مثر، مهر، – مسر- مشرە، مترە و میترایی کە بە واتای میهرەبان و دڵسۆز و بە بەزەیی دێت، وشەی خۆر هەروەکو شێوازی هەورامانی ئێستا، جاران پێی دەگوترا ( **هۆر**). ناوی ( **هۆرمز**) ی خودا، کە دواتر پێی دەگوترا (ئاهۆرامزدا) هەر هەمان ناوی هۆر یان خۆرە و لە ئاینی زەردەشتیدا، بۆتە ناوی خودای تاك و تەنیا، یان خودای ڕووناکی لە بەرامبەر ئەهریمەن کە خودای جیهانی تاریکییە.

**هەتاو**/ وشەی هەتاو، ناوێکی تری خۆر یان ڕۆژە. وشەکە ڕەگی بۆ کۆنترین شارستانییەتیی میسۆپۆتامیا دەگەڕێتەوە. خودای خۆر یان هەتاو لە ژێر ناوێکی نزیکی ئەوە، ناوی هاتووە سۆمەرییەکان بە هەتاویان دەگوت (تو). ئەگەر لە هەتاوەوە دەست پێبکەین و بۆ دواوە بگەڕێینەوە دەبینین بەم جۆرە بووە: هەتاو – تاو – تاوس – تاووز – دوموز تا تەموز کە هەتاو تێدایدا تین و تاوی دەگاتە ئەو پەڕ. وشەی تاو و تینیش هەر لە هەتاو دروست کراون.

**تاوسان**/ لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا، لە جیاتی وشەی هاوین کە بۆ وەرزی گەرمی ساڵ بەکار دێت، وشەی تاوسان بەکار دێت. وشەکە لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە. **تاو** کە هەتاوە یان تین و تاوی خۆرە + سان کە واتای هەڵهاتن و درەوشانەوەی خۆر دەگەیەنێ. سان بۆ بەهێزبوون و بە توانابوونیش دێت وەك گەرماکە تاوی سەند. یان ئاگرەکە تاوی سەند. بارانەکە بەخوڕترە و تاوی سەندووە. بۆ

درەوشانەوەش سەیر دەکەین لە ناوی ( خوراسان) دیارە، کە لە سەردەمی ساسانییەکان، ئەو ناوەی لێندراوە، چونکە خۆر لەلای خۆرهەڵاتەوە دایسێ و هەڵدێ، بەم جۆرە تاوسان واتا خۆر درەوشانەوە یان تینسەندنی خۆر. ئەمەش گەرمترین کەژی ساڵ دەگەیەنێ.

**یەڵدا**/ وەك باوە شەوی یەڵدا، درێژترین شەوی سەری ساڵە. ئەم شەوە دەکەوێتە نێوان هەردوو رۆژی ٢٠ و ٢١ی دیسێمبەری هەموو ساڵێك. ئەمەش ئەو کاتەیە کە هەردوو بورجی کارژۆڵە و کەوان لە یەکتری تێدەپەرن. لە دوای ئەمەوە چیتر شەو درێژ نابێت، بەڵکو دووبارە رۆژ، بەرە بەرە تیشکی زێرینی لەسەر زەوی دەدرەوشێتەوە. میتراییە رۆژپەرستەکان، بە رێورەسمی تایبەت شەوی یەڵدایان بەرێ دەکرد، بۆ ئەوەی رۆژی ٢١/ ١٢ جەژن بگرن، چونکە لایان وابوو کە ئەو رۆژە، رۆژی لە دایکبوونی رۆژە. شەوی یەڵدا تا ئێستاش لە رۆژهەڵاتی کوردستان، یادی دەکرێتەوە و هەندێ دابوونەریتی تایبەت بە خۆی هەیە. شاعیرانی کلاسیکی کورد، لە شیعرەکانیاندا هێمایان بۆ ئەو شەوە کردووە کە جاران لە هەموو کوردستاندا یادی دەکرایەوە. وشەی ( یەڵدا) لە زمانی ئارامیەوە وەرگیراوە کە بۆ ماوەیەکی درێژ زمانی لە یەکترگەیشتنی گشتی بووە لە رۆژئاوا. ( یەڵدا) واتا لە دایکبوون. دیارە مەبەست لە لەدایکبوون و زیندوبوونەوە و درێژبوونەوەی رۆژە.

لە سەدەی سێیەمدا، مەسیحییەکان لەگەڵ میتراییەکاندا توشی ململانێیەکی ئایدیۆلۆجیی توند بوون. ململانێکە بە قازانجی باڵادەستی ئاینی مەسیحی کۆتایی هات، بەڵام مەسیحییەکان بۆ لە خۆ گرتنی میترایەکان و بۆ خۆ راکێشانیان، یادی لە دایکبوونی رۆژیان کرد بە یادی لە دایکبوونی عیسای مەسیح، دیارە بە تێپەڕبوونی کات و دوای چەندان جار دەسکاریکردن و چاکترکردنی رۆژمێر، یادی لە دایکبوونی عیسا کەوتە ٢٥/ ١٢. مێژوونووسانی ئەوروپی لەم بارەیەوە بەڵگەیان زۆر کۆکردۆتەوە و چیتر ئەم تێکەڵکێشیە جێگای گومان نییە.

**خەم**/ بە واتای پەرێشانی و پەژارەو ئازار خواردنی کەسێك دەگەیەنێ، بە لە دەستدانی کەسێك، یان شتێکی زۆر گرنگ. خەم لە رەنگی (خم) وەرگیراوە. رەنگی خم، رەنگێکی مەیلەو رەشە، **خمچیان** لە هەندێ گژ و گیاو رەگی درەختی تایبەتی دەریدێنن بۆ رەنگکردنی جلو بەرگ. جاران ئەو کەسانەی پرسەیان رابگەیاندبایە، دەبوو جلو بەرگی خمکراو لە بەر بکەن. نەریتی جلوبەرگی رەش پۆشین، درێژەی هەمان نەریتی

جلوبەرگی خمکراوە. بۆیەشە ئەوەی جلوبەرگی خمکراوی لەبەر بوایە ئەوا خمبار بوو. دواتر وشەی خمبار بۆ خەمبار و خەم گۆڕاوە.

**هەش/** ماددەیەکی خمسازیە. بۆ رەنگکردنی جلوبەرگ بەکار دێت. رەنگەکەی رەشە. قوڕی شلی رەشباو کە (**قوڕە شین**)ی پێدەڵێت، هەندێ جار بە هەش دەچوێندرێ. (**هەش بەسەر**) بە کەسێکی بێناگا دەوترێ کە فێڵی لێکراوە بێ ئەوەی پێیزانیبێ. هەش بەسەر لە دەربڕینی (**قوڕ بەسەر**) جیایە. ئەمەی دواییان مەبەستە لە کەسێکی بێدەسەڵات کە ناتوانێ خۆی و بەرژەوەندیەکانی خۆی بپارێزێ و ستەمی لێدەکرێت.

**شین/** هەڵواسین و پۆشین و هەڵگرتنی پارچەی شین، وەك نیشانەی خەمبارێتی و پرسە، نەریتێکی زۆر کۆنە. لە سەر دەمانێکدا، پیاوانی پرسەدار، دەبوو پەڕۆیەکی شین لە سەرشانیان قایم بکەن. ئێستا چیتر رەنگی شین ئەو رۆڵە ناگێڕێ، بەڵام وشەی شینگێڕان وەکو دەربڕینی خەمباری بۆ مردوان، تا ئێستاش لە زمانی کوردیدا بەکار دێت. لە سەدەی دەیەمدا، عەباسییەکان جولەکەو مەسیحییەکانیان ناچار دەکرد تا گەر لە ماڵ هاتنەدەرەوە جلی شین بپۆشن، لەلایەکەوە تا خەڵك بیانناسنەوە. لەلایەکەی تریش بۆ ئەوە بوو کە ئەوان لە ناو خەڵك دا سوکایەتیان پێبکرێت وا دەربخرێن کە هەمیشە پرسەدارن.

**رەنگی شین/** لە زمانی کوردیدا، جۆرێك لە نادیاری و ناروونی لە ناولێنانی ئەو شتانە دەردەکەوێت، کەرەنگیان شینە ئەم نادیاریە هێشتا ئاڵۆزتر دەبێت، کاتێ هەردوو رەنگی **شین** و **سەوز** یان **کەسك** جێگۆڕکێیان پێدەکرێ، وەك دواتر باشتر روونی دەکەینەوە. بەشی هەرە زۆری خەڵك رەنگی (شین) بۆ رەنگەکە بەکار دێنن، کەچی خەڵکی خواروو و خوارووی رۆژهەڵاتی کوردستان بە شین دەڵێن **کەوە** یان **کەوی** لە شوێنەکانی تری کوردستان لە جیاتی کەوە، بە رەنگی خمی گیراوە دەگوترێت (**چویت**). هەروەها ئەسپێکی خم یان بۆررەنگ، پێی دەگوترێت ئەسپە **کەوێت**. دیارە کە کەوە و چویت و کەویت هەر رەنگی شینن.

لانی کەم لە بارێکدا، رەنگی شین لە هەندێ شوێنی کوردستاندا، لەگەڵ سەوز یان کەسك جێگا ئاڵۆگۆڕ دەکات. لە کشتوکاڵدا، گەر سەرنج بدەینە چاندن و رواندنی بەرهەم، ئەوا دوای ئەوەی بەرهەمەکە لە زەوی دێتە دەرەوە پێی دەڵێن (**سەوز**) بوو. دیارە کە رەنگی گەڵای تازە سەوزە. کەچی بۆ هەمان کار لە هەندێ ناوچەی تردا دەڵێن

(شین) بوو. ئاساییە كاتێ كە جوتیارێك دەڵێ: هێشتا دەغڵەكەم شین نەبووە، یان كوڵلە شینایی لە وڵات نەهێشت و زۆر نموونەی تر، من سەرچاوەیەكی دیارم لە بەردەستدا نییە تا بتوانم تێبگەم بۆچی رەنگی شین ئاوای لێ بەسەر دێت. ئەوەی سەرنجم رادەكێشێ وشەی (شین)ە لای هەندێ لەو هاوسێیانەمان كە زمانەكەیان سەر بە هەمان خێزانی هیندۆئەورووپیە، بە زمانی فارسی شین (كەبودی) پێدەگوترێ كە لە كەوەی كوردی دەچێ. بە زمانی ئەرمەنیش بە شین دەگوترێ (كاپویت) كە بەلای منەوە لە كەویت و چەویت نزیكە، بە زمانی رووسیش شین پێیدەگوترێ. (سینیی) شین لە كوردیدا بەواتای زل و زەبەلاحیش بەكارهاتووە وەك شینە شاهۆ شینە زەلام هتد. . .

**ماجی/ ماگی/** وشەی ماجی لە زۆربەی زمانە ئەورووپیەكان، بە شێوەی ماجی، ماجیك یان ماگی هەیە. بۆ كەسانی جادوگەر، دەستسوك، پێشگۆزان و خەڵەتێنەر بەكار دێت. رەگی وشەكە بۆ ناوچەی ئێمەو ئاینی زەردەشتی دەگەڕێتەوە، بەپێی گێڕانەوەكانی ئینجیل، كاتێ كە عیسای مەسیح لە شاری (ناسرە) لە دایك بوو، سێ ماگ یان موغی زەردەشتی، لە وڵاتی ماد، لە رێگای خوێندنەوەی ئەستێرەو بورجەكانەوە، زانیان كە عیسای پێغەمبەر لە دایك بووە، لە هەندێ سەرچاوەدا لە جیاتی سێ، بوونەتە دوازدە. ئەو ماگانە كە بە (سێ ژیرەكە) ش ناسراون، بە دیارییەوە دێنە سەردانی عیسا و مژدە و باوەڕپێهێنانی خۆیانی پێڕادەگەیەنن. بەم جۆرە وشەی موغ یان موگ و ماگ لە رێگای بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی، دەكەوێتە ناو زمانەكانی تر. ماگیش بەو كەسە دەگوترێ كە هەندێ شت دەزانێ لە توانای مرۆڤی ئاسایی بەدەرە.

**مەجوس/** وشەی مەجوس لە ئاینی ئیسلامدا، بەو كەسانە دەگوترێ كە گوایا ئاگرپەرستن. هەر چەند لە قورئاندا (مەجوس) لە پاڵ ئاینی جولەكەو مەسیحی و سابیئە، وەكو ئاینێكی سەربەخۆ ناوی هاتووە. وشەكە لە (موغ) یان (ماگ)ی زەردەشتییەوە وەرگیراوە كە بە پیاوی ئاینیی زەردەشتی دەگوترا، گرێكەكان پاشگری(وس) دەخەنە سەر ناو. وەك لە ناوەكانی عیسا (ئیسا) — ئیسوس و یونووس، موسیوس و هیتریش دەبینین. بەم جۆرە موغ یان موگ و ماگ پێیگوتراوە ماگوس. لە بەر نەبوونی پیتی(گ) لە زمانی عەرەبی و ئارامی، ماگوس بووە بە ماجوس و دواتریش مەجوس.

**مزگەوت**/ کە بە زمانی عەرەبی پێی دەڵێن (مسجد) لە دوو وشەی لێکدراو لە ئاینی زەردەشتی وەرگیراوە. بەم جۆرەپێکهاتووە. وشەی مز کورتکراوەی **مەز** یان **مەزدە** کە مەبەست لە خودایە **هورمز** یان **هورمەزد** یان **ئاهورامەزدا**. **گەو** یش جێ یان شوێنە. بەم جۆرە مزگەوت جێی پەرستنی مەزد یان هورمز بووە، کە چی ئەمڕۆ شوێنی هەرە ناسراوی خودا پەرستیە لە ئاینی ئیسلامدا.

**مجێور**/ **مجێور** بە خزمەتکاری مزگەوت دەگوترێ. وشەی مجێوریش، هەر وەك مزگەوت خۆی لە ئاینی زەردەشتیەوە بۆمان ماوەتەوە. پەرستگا یان مزگەوتی زەردەشتی موگ یان ماگی تێدابووە بۆ ئەنجامدانی ڕێورەسمی ئاینی. بۆ ئاگا لێبوون و پاك ڕاگرتنیش ماگ یارمەتیدەرێکی (وار) هەبووە کە پێی دەگوترا **ماگوار** یان **ماجوار** و دواتر لە سەر زمان سوکتر بۆتەوە و گۆڕاوە بۆ **مجێور**.

**مەرگەسات**/ بریتیە لە ژیانێکی پڕ لە کوێرەوەری و تاڵ و سەخت. بەشی یەکەمی وشەکە (مەرگ) بریتیە لە مردن. بۆ نموونە جوانە مەرگ، مردنی کە سێکە بە تەمەنی گەنجی و لاوی. مەرگەسات بە مردنێکی پڕئازاریش دەگوترێ. لام وایە وشەی مەرگەسات لە وشەیەکی تر وەرگیراوە کە لە سەردەمی دەسەڵاتی ساسانیاندا باو بووە. لەو سەردەمەدا، گەر بڕیاری مردنی کەسێك بدرایا، ئەوا دەگوترا کە ئەو کەسە (**مەرگەسان**) دەکرێت. ئایا مەرگەسان لە مەرگ ئاسانەوە هاتووە؟ یان وشەیەکی یاسایی ئەو کاتە بووە؟

**پەرێز**/ ئێستا بە شوێنی کۆکردنەوەی بەرهەمی چێنراو دەگوترێ، پەرێز جاران بەو شوێنە دەگوترا کە هەمیشە سەوز و پڕ لە دارو درەخت و گوڵ بووە. لە باوەڕی میتراییە ڕۆژ پەرستەکان، پەرێز ئەو بە هەشتە بوو کە مرۆڤی باوەڕدار بۆی هەبوو هەتایە بە نەمری تێدایدا بژێنێتەوە . ئاینی میترایی لە سەدەی یەکەمی زاینیدا، بە ئیمپراتۆریای ڕۆم بڵاوبووەوە لەگەڵ بڵاوبونەوەی میترایی، چەندان وشەی ئەو ئاینەش لە زمانەکانی ئەوروپادا جێگای خۆیان کردەوە وەك: کڵاوی میترا کە ڕێبەری ئاینی ئەرتەدۆکسی گرێکی لە سەری دەبەستێ. وشەی (پەرێز)یش بە شێوەی (**پەرە دیس**) بە واتای بە هەشت، لە زۆربەی زمانە ئەوروپییەکان بەکار دێت. عەرەبەکانیش هەمان وشەیان وەرگرتووە و بۆ بە هەشت بەکاری دێنن، بەو شێوەیەی کە لە قورئاندا هاتووە(**فیردەوس**). ئەوەی جێگای تێبینی ئێمەیە کە وشەی پەرێز لە

(ئاوێستا)دا بەکارهاتووە. شێوە ئاوێستاییی وشەکە بریتی بووە لە (pridaus، پری داوس) کە واتاکەی (پردی هەتاو) دەگەیەنێ. ئەمەش ئەو پردەیە کە باوەڕداران بەسەریدا دەپەڕنەوە بۆ ناو بەهەشت. ئەم بیرۆکەیە دواتر کەوتە ناو سێ ئاینە ئاسمانییەکەش.

**پەتیارە**/ بریتیە لە کەسێکی بەرەڵلا، کە ناتوانێ هیچ لێپرسراوییەك بخاتە سەر شانی خۆی. کەسێکی بێکار و تەوەزەل کە ناتوانێ بە شێوەیەکی رەوا خۆی بژیێنێ. کەسێکی کارو کردار خراپ کە چاکەی لێناوەشێتەوە و لێی چاوەڕوان ناکرێ. وشەی پەتیارە لە ئاینی زەردەشتیەوە هاتووە و بەشێکە لە میتۆلۆجیای ئاینی زەردەشتی. بە گوێرەی دەقەکانی ئاینی زەردەشتی، پەتیارە بریتیە لە بەدی و خراپیەك کە ئەهریمەن لە تاریکیی بێبڕانەوە بەدیهێناوە.

**نەیار**/ واتا ناحەز. وشەکە پێچەوانەی یارە. وەك دیارە وشەی نەیار رەگی بۆ وشەیەکی کۆنتر دەگەڕێتەوە. کە لە سەردەمی ساسانیاندا بە واتای نەیار یان بێگانە بەکار دەهات. ساسانییەکان بە بێگانانیان دەگوت ئەناریاکۆی Anariakoi. هەندێ مێژوونووس وای بۆ دەچن کە ئەم وشەیەش کۆنتربێت و مەبەست جیاکردنەوەی هۆزە هیندۆئەورووپییەکان بێت لەگەڵ خەڵکی بومی و بنەڕەتدا. واتا بە خەڵکی ناوچەکە وتراوە ئاناریان یان ئەناریا. ئەم وشە کۆنە بە شێوەی (**نەیار**) لە زمانی کوردیدا ماوەتەوە.

**نوشتە**/ پارچە کاغەزێکی پێچراوەیە کە هەندێ نزاو پاڕانەوەی تێدادا نووسراوە. ئەو کەسانەی نوشتەکەیان بۆ نووسراوە. لە شوێنێکی جلوبەرگیان هەڵیدەواسن تا یارمەتیان بدات لە چاکبوونەوە یان بە مراز گەیشتن. نوشتە لە نوشتانەوەوە هاتووە. چونکە کاغەزەکە هەمیشە دەنوشتێندرێتەوە، واتا دەپێچرێتەوە. سەیر ئەوەیە کە وشەی(نووسین)یش هەر لە نوشتاندنەوە هاتووە. جاران نووسراوی گرنگ کە لە پاشاو کاربەدەستانەوە بۆ یەکتر دەنێردران، هەمیشە دەنوشتێندرانەوە. بەمەش کاری نووسین و کاری نوشتاندنەوەی نووسین، وەك یەك کار سەیری کراوە. نووسین سەرەتا نوشتن و نوشتە و نووستە بووە تا بۆتە نووستین و نووسین.

**درهەم**/ وشەی درهەم، بە جۆرێك لە دراو دەگوترێت کە لـە عێـراق و یۆنـان و چـەند وڵاتێکی تری ڕۆژهەڵات، بەکار دێت، درهەم پارەیەکی کـۆنی وڵاتـی ئێمەیـە. ناوەکـەی وشەیەکی لێکدراوە. بریتیـە لە دوو وشەی **دەر** + **هەم** کە واتای (لەناو یەك) دەگەیـەنێ. جاران پارەی میتاڵ بۆ پتەوبوون لە دەرهەمکردن و تێکەڵاوکردن، یان خستنە ناو یـەکی دوو میتاڵ، دروست دەکرا. بەم جۆرە بـەو پارەیـە دەگـوترا دەرهـەم. وشـەی دەرهـەم بـە تێپەڕبوونی کات لەسـەر زار گـۆڕاوە و بۆتـە **درهـەم** — **درام** — **دراو**. گرێکـەکان، چ بـۆ بازرگانی، یاخود وەکو کرێگرتەی شەرکەر، یاخود بە پـەلامارهێنان هاتوونەتـە وڵاتمـان. لەو تێکەڵاویەدا، گەلێك شت ئاڵوگۆڕکراوە، لە وانـە وشـەی درهـەم کـە بـەگرێکی بۆتـە (**دراخما**).

**هەینی**/ وشەی هەینی، ناوی دوا ڕۆژی حەوتەیە. وشەکە لە بنەڕەتـدا لـە شـێوەزاری فەهلەوی یان فەیلی، سەردەمی ساسانیاندا بەکار هاتووە. وشەکە لە سـەردەمی خۆیدا بە شێوەی (ئادینە) گۆکراوە. دواتر بەم جۆرە لەسەر زار گۆڕانی بەسەر داهاتووە: **ئادینە** — **هادینە** — **هاینە** — **هەینی**. . فارسەکان لەم دوایە دووبارە هەوڵیانداوە کە وشەی ئادینە بخەنـە نـاو زمـانی نووسـینەکانیان، هـەروەك پێـشتر لـە بێناگـایی و نـەبوونی دەزگـای ئـەکادیمی کوردیـدا، زۆر وشـەی تریـشیان بـۆ خۆیـان بـردووە، بـە تایبـەت لـە بـواری سەربازیدا. زۆر لەو وشە کۆنانە، بە کەمێ گۆڕانـەوە، تـا ئێـستاش لـە زمـانی کوردیـدا بەکار دەبرێن.

**دەسـتوور**/ بـە یاسـای بنـچینەیی دەوڵـەت دەگـوترێ. دەسـتوور سەرچـاوەی گـشت یاساکانە. وشەی دەستوور وشەیەکی ئاینی بووە. ئێمە وەکو زۆر وشـەی تـری ئـاینی لـە ئاینی زەردەشتیەوە بۆمان بە جێماوە. جـاران، کـە هێـشتا ئـاینی زەردەشـتی پێڕەوانـی زۆری هەبوو، ئـەوا لـە هـەر گونـدێك، ڕێبـەرێکی ئـاینی هـەبوو، تـا سەرپەرشـتی ئـەو ڕێورەسمە ئاینیانە بکات، کە لە ئاینـدا هـەبوون، هـەروەك مـەلای ئێـستا. بـەو ڕێبـەرە ئاینییە دەگوترا دەستوور. خەڵکی گونـد، دەبـوو بـۆ هـەر پـرس و پێـشهاتێك پـرس بـە دەستوور بکەن و بە گوێرەی بڕیار و ڕێنماییەکانی ئەو بجوڵێنـەوە. ئەگـەر کەسـێك ملـی نەدابا بەرکارێك ئەوا بە بیریان دەهێنایەوە کە ئەمە بڕیاری دەستوورە و کەس بۆی نییـە لێی دەربچێ. نەریتی دەستوور لە لادێ زەردەشـتیەکان تـا دەرەنگـانێکیش دوای ئیـسلام هەر مابوو. تەیموری لەنگ لە یادەوەریەکانی خۆیدا نووسیویەتی کە لە شـاری دارابگـەر

زۆر نەخۆش بووم، پیرەمێردێکی بە ساڵدا چویان هێنا لام بۆ دەرمانکردم و گوتیان ئەمە(دەستوور)ی مەجوسانە. ئێستا لە لادێکانی کوردستان، دەستوور واتا شتێك کە نابێ لێی لابدەی و نەیکەی.

**دیان**/ مەسیحیانی کوردستان، بە زۆر ناو دەناسرێنەوە. هەندێ لەو ناوانە لە خودی ئاینی مەسیحی کۆنترن وەك تەرسا یان گاور کە لە گەبری زەردەشتییەوە هاتووە. لە ناوچەکانی هەولێر، بە مەسیحیەکان دەڵێن دیان وەك دەزانین لە سەردەمی دەسەلاتی پارتەکاندا، لە سەدەی دووەمی زاینی، میرنشینێکی نیوە سەربەخۆ لە هەولێر (ئەربیل) دەسەلاتی هەبووە بە ناوی حەدیاب یان ئەدیاب و ئەدیابنە.

لەسەدەی دووەم و سێیەمی زاینیدا، ئاینی مەسیحی لە هەولێر، بە فراوانی پەرەی سەند. دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام و پاشەکشەی مەسیحی، کەمایەتیی مەسیحی ناوچەکە، وەك خەڵکی بنەڕەتی و خاوەنی میرنشینی **ئەدیابنە**، هەر بەو ناوەوە ناسران. ناوی ئەدیابنە بە تێپەڕبوونی کات لە سەرزار گۆڕانی بەسەر داهات بە شێوەی **ئەدیابنە – دیابنە – دیانە –** تا دواتر، وشەی **دیان**، بوو بە پێناسەی ئاینی نەتەوەیی، مەسیحیە ئارامیزمانەکانی ناو شاری هەولێر و دەوروبەری.

**کەی**/ وشەی کەی وەك نازناوی پاشایەتی، بۆ پاشاکانی ماد بەکار هاتووە. ئەمڕۆ کەی بە واتای پاشا، لە زمانی کوردیدا بەکار نایەت، بەڵام وشەکە بە لێکدراوی لەگەڵ وشەی تر، هێشتا لە زمانی کوردی بەکار دێت. کەی، لە بنەڕەتدا لە فرمانی (کردن)ەوە هاتووە، ئەوانەی کە کاریان دەکرد بۆ خەڵکەکەیان، ئەوا لەگەڵ بە ئەنجامدانی کار، دەسەلاتیشیان پتر دەبوو بەسەر خەڵك، یان رێبەری خەڵکیان دەکرد. بەم جۆرە (کەی) لە (کردی)یەوە گۆڕاوە. هەمان فرمان لە هەندێ لە زمانە هیندۆئەوروپییەکانی تریش، وشەی پاشای لێدروست کراوە. لە زمانە سکەندیناڤیەکانی وەك سویدی فرمانی کان (kan) کە چاوگەکەی (کوننە kunna)یە بۆتە **کوننونگ** و دواتر **کونگ** کە واتای پاشایە، هەمان وشە لە ئینگلیزی بۆ **کینگ** گۆڕاوە.

**کەی سەرا**/ سەرا، ئەو کۆشك و باڵاخانەیە کە پاشا، یان (کەی) تێدایدا کاروباری وڵات رادەپەڕێنێ. لە کۆندا، لە جیاتی پاشا (کەی) بەکارهاتووە. لە جیاتی (کۆشك)یش (سەرا). بۆیەشە کۆشکی پاشا بۆتە کەیسەرا. کەیسەرا بە ئاسانی بۆتە وشەیەکی لێکدراو، تا وایلێهاتووە کە وشە لێکدراوەکە هەر بە واتای پاشا بەکار بێت، وەك لە

ناوی کیسراکانی ساسانیدا دەبینریّ. وشەکە لە ڕێگای ئاڵوگۆڕی کولتوورییەوە کەوتۆتە ناو زمانی گرێکی. دواتریش زۆر لە زمانەکانی تر، وشەی کیسرایان بۆ پاشاکانیان بەکار هێناوە. بێگومان بەکەمێ گۆڕان لە گۆکردن تا لەگەڵ هەر زمانێك بگونجێت. بەم شێوەیە کەیسەرا بۆتە: **کەیسەر**، **تسار**، **شەیسەرێ** و **قەیسەر**.

*__کابان/ کابان__، لە زمانی کوردیدا، ناوێکی ژنانەیە. ناوەکە وەکو سیفەتێك بۆ ژنان پتر ناسراوە. بە ژنێك دەگوترێ کابان کە: بەرێزە، خانومانە، ماڵداریکەرە، لێزان و شارەزایە، میواندۆستە. هەروەها کابان بە ژنێکیش دەگوترێ کە لەماڵ بڕیاردەر و خاوەن دەسەڵات بێت.

وشەکە پەیوەندی بە بنەچەو خێزانەوە نییە. گرنگ نییە ژنێکی کابان، لە خێزانێکی دەوڵەمەند و شازادە بێت. وشەی کابان، بۆ سەردەمێکی مێژوویی کۆن و بەسەرچوو دەگەڕێتەوە. وشەکە لێکدراوە، بەشی یەکەمی وشەکە (کا) واتای (کەی) دەگەیەنێ کە پاشایە. بڕگەی دووەمیش (بان) لە بنەڕەتدا (بانو) بووە کە واتای خانم یان ژنێکی ڕێزدارە. بەم جۆرە کابان لە سەرەتاوە **کەیبانو** بووە کە پاشا ژن یان شاژن دەگەیەنێ. کەیبانو، بە نەمانی پاشایەتی، لە زمانی کوردیدا، واتا بنەڕتیەکەی لە دەست داوە، گۆکردنی وشەکەش لەسەر زار کەمێ گۆڕانی بەسەرداهاتووە. بەڵام تا ئێستاش وەکو سیفەتێکی بەرزو باش بۆ ژنان بەکار دێت.

هەمان وشەی کەیبانو لە زمانە سکەندیناڤیەکان بە شێوەی کڤینە گۆ دەکرێت کە واتای(ژن)ە. (کوین)ی ئینگلیزیش کە بۆ شاژن بەکار دێت، لە کڤینەی سکەندیناڤیەوە وەرگیراوە و لە بنەڕەتدا ڕەگی گۆڕاوی وشەی کەیبانو یان کابانە.

تالان/ تالان، دەستبەرسەرداگرتن و زەوتکردن و بردنی شتێکە، لە لایەن کەسێك، یان کەسانێکەوە، بێئەوەی خاوەنی شتەکە بن. زۆر جار تالان، هاوشانە لەگەڵ هەڵکوتانە سەری چەکدارانە، کاری چەتەیی یان پەلاماری سەربازی. وشەی تالان لە بنەڕەتدا واتایەکی تری هەبووە. وشەکە بۆ سەردەمی دەسەڵاتی دارای یەکەمی هەخامەنشی (٥٥٢ – ٤٨٦ پ. ز) دەگەڕێتەوە. دارای یەکەم پێداچوونەوەی بە سیستەمی باج وەرگرتن کرد. بۆ وەرگرتنی باج لە وەرزێران، بڕیاردرا، باجەکە لە بەروبومی بەرهەم هێندراویان وەربگیرێت. بۆ ئەو مەبەستە پێوانەیەك داندرا بە ناوی (تالان) بۆ کێشانی بڕی بەرهەمی قرسێندراوی هەر وەرزێرێك کە وەك باج دەبوو بیدات. تالان کێشەکەی

نەختێ لە (٢٦) کیلۆگرامی ئێستا پتر بوو. دەستەی باجبەر، بە پارێزگاری کۆمەڵێك سەربازو گالیسکە، بەسەر دێکاندا دەسوورانەوە بۆ بە (تالان) پێوانی ئەو برە باجەی هەر وەرزێرێك، دەبوو بیدات. دیارە خەڵکی لادێکان خۆشیان لەم کارە نەهاتووە. بە شێوەی جۆراو جۆر یەکتریان لە هاتنی (تالان) ئاگادار کردۆتەوە، تا وەرزێرانی تر، ئەوەندەی دەکرێ، بەروبوم و داهاتیان تەقەت بکەن و وابکەن کە بەرچاو نەبێت. بەڵام (تالان) زۆر دلڕەقانە و بێبەزەییانە، کەوتۆتە و ێزەیان. ئەمەش بۆتە بە نەمری و زیندویی مانەوەی وشەی (تالان) بۆ هەتا هەتایە لە زمانی کوردیدا.

زێ/ یان زاب ناوی کۆن و مێژوویی هەردوو رووبارە بەناوبانگەکەی باکوور و باشووری هەولێرە، زاب لە دوو وشەی لێکدراوی فەهلەوی پێکهاتووە: (زە) کە زۆر دەگەیەنێ لەگەڵ (ئاب) کە ئاوە. بەسەر یەکەوە دەبێتە ئاوی زۆر. زواب یان ئابزو، ناوی ئەفسوناویترین شوێن بووە لە ئاین و میتۆلۆجیای سۆمەریدا. (ئاب) لە زمانی سۆمەریدا بە واتای (ئاوێکی زۆر) یان (دەریالوش) لێکدراوەتەوە، وشەی (زو)ش گوایە (زرنگ و زیرەك)ی دەگەیاند. ئابزوی سۆمەری ئەو شوێنە ئەفسوناویەیە کە سۆمەرییەکانی لێوە هاتوون، هاوکات سەرچاوەی بنەرەتی هەموو شتێکیشە. گومانی ئەوە هەیە (ئابزوی ) سۆمەری هەمان (زێ ئاب) یان زێی مەبەستی ئێمە بێت، زێ لەژێر ناوی (سوف زابا) لە میتۆلۆجیای سابینە مەندائیەکانیشدا، رۆڵێکی پیرۆزو تایبەتی پێدراوە، چونکە ئەو روبارە بواری پەرینەوەی بۆرەخساندون تابێنە وڵاتی میدیا.

**گۆگەمێلا**/ ناوی شوێنێکە کە شەرگەی پێکدادانی گەورەترین دوو لەشکری زلهێزی دنیای کۆن بووە. ئەسکەندەری مەکەدۆنی، لە گۆگەمێلا، رووبەرووی لەشکری دارای سێیەم بووەو سەرکەوت، ئەم شەرە لە ساڵی (٣٣١ پ. ز) رووی دا. ئەسکەندەر بەو سەرکەوتنە، دەرگای هەموو رۆژهەڵاتی بۆ خرایە سەر گازەرای پشت. شەرەکە بە شەری (ئەربێلا) ناسراوە، چونکە هەولێر گەورەترین و گرنگترین شاری ستراتیژی بووە لە نزیك مەیدانی پێکدادانەکە. بنکە و بنەی داراش هەر لە هەولێر داکوترابوو. زۆر جار بیرم لە ناوی (گۆگەمێلا) دەکردەوە. تا ئێستا ئەرکیۆلۆجەکان مەیدانی ئەو شەرە گەورە و یەکلایکەرەوە یان نەدۆزیوەتەوە. ناوی هەموو دێهات و شوێنەکانی دەوروبەری هەولێرم لەگەڵ گۆگەمێلا بەراوردکرد، نەگەیشتمە بەرەنجامێك. ماوەیەك بیرم بۆ گوندی شەبەك نشینی (گۆبجەمیل) چوو کە ئێستا بۆتە گەرەکێکی بەری رۆژهەڵاتی شاری موسل. بۆ

نا، خۆ موسل ئەوکاتە وێرانە بووەو هەر هەولێر نزیکترین شاری گەورە بووە. لەم ڕۆژانەدا بە بەندی حەیرانێك یان لاواندنەوەیەکدا چومەوە کە ٢٨ ساڵ پێش ئێستا لە دەمی دایکمم گوێ لێبوو. لەو بەندەدا نیوە دێرێك رایچەنیم (**لە پردی خازرێ، ئاوی گۆملێ**) بەڵێ ئاوی یان جۆی گۆمل لە نێوان (بەردەڕەش)و شاخی مەقلوب، لەسەر رێگای هەولێر – موسل هەڵکەوتووە، سەیرە، کە ناوەکە گۆڕانێکی ئەو تۆی بەسەردا نەهاتووە. تۆپۆگرافیای مەیدانی شەڕەکە و بوونی جۆگە ئاوێك لە نێوان هەردو لەشکر، هەمان تۆپۆگرافیای جۆی گۆملە. ناوی شەڕگاکەش لە جۆ گۆملەوە بە(گۆ گۆمل) و (گۆ گەمێل) تۆمار کراوە. پاشگری (ا) ی گریکیش چۆتە سەر هەردوو ناوی (ئەربێلە) و (گۆ گەمێل) و هەردوو ناوەکە بوونەتە (ئەربێلا) و (گۆگەمێلا). ئێستا تەنیا ئەوە ماوە کە چەند پسپۆڕێکی ئەرکیۆلۆجی بچن و شوێنەواری ئەو شەڕگە مێژووییە بدۆزنەوە. بێگومان پڕیەتی لە پەیکەرە ئێسك و شمشێری شکاو و کەلوپەلی ئەوکات.

کەپۆ/ لە هەندێ شوێنی کوردستان بۆ لوت بەکار دێت. وشەی کەپو یان کەپۆ لە دوو وشەی لێکدراو پێك هاتووە. (**کە**) کە لە **کێوەوە** وەرگیراوەو بەرە بەرە گۆڕاوە بۆ **کۆ** و کە. هەروەها وشەی پو یان **پۆ** کە واتای بەرزی و لوتکە دەگەیەنێ هەروەك لە (**تان و پۆ**)دا بەهەمان واتا بەکار دێت. هەردوو وشەکە بەیەکەوە کە + پۆ واتا لوتکەی کێو. وشەی **لوتیش** هەر لە لوتکە یان تەپۆلکەوە هاتووە.

**کالە**/ جۆرە پێڵاوێکی سوکی لە خوری دروستکراوە. هاوینان بە تایبەت خەڵکی لادێکان، لە پێیان دەکرد. دیارە وشەی کلاشیش هەر لە کالەوە هاتووە. لە دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام، حاجیانی کوردستان هەمیشە لە رێگای ئورشەلیمی قودسەوە سەردانی حیجازیان دەکرد. ئەم نەریتە تا هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عوسمانیش هەر مابوو ماوەیەکی کورتی سەدەی دەیەم و یازدەمی لێدەربچێ، بە هۆی شەڕی خاچپەرستانەوە. دیارە شاری ئورشەلیم مەکۆی سەردان و مانەوەی حاجیانی ئەورووپییش بووە. لە رێگای ئەم تێکەڵاویەوە، هونەری کالە دروستکردن و لە پێکردن پەڕیوەتەوە ئەورووپا. حاجیانی ئەورووپی کە بەسواری یان پیادە بۆ ئورشەلیم دەهاتن، پێڵاوەکەیان لە خوری پەستراو، یان لباد دروست دەکرد و پێیان دەگوت **کالیك** یان بە لاتینی پێی دەگوترا **کالیگە**، Caliga.

**خاپەرۆك/** بریتیە لە پاشماوەی یان بەرماوەی خراپ و بێکەڵکی شتێك. کاتێ کە گەنم یان ئارد لە بێژینگ دەدرێ، سەر بێژینگەکە یان کەپەکەکە، کە درشتەو ناچێتەخوارەوە، خاپەرۆکی پێ دەڵێن. کاتێ کە فرۆشیارێك میوە، یان شتی تر دەفرۆشێ و تەنیا کەمێکی پەسەند نەکراوی دەمێنێتەوە ئەوا خاپەرۆکی ماوەو نرخی دادەبەزێنێ.

وشەی خاپەرۆك بیرمان بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن دەبوتەوە. سەردەمی ئیمپراتۆرە زلهێزەکانی ئاشووری، میتانی، میتی، بابلی و فیرعەونی. لەو سەردەمەدا لەشکرکێشی بە ئەسپ و گالیسکەو پیادە ئەنجام دەدرا. لەشکر بۆ هەر کوێیەك چووبا، پێویستی بە دابینکردنی خۆراك و ئالیك و دەستی کار هەبوو. بۆیە پێشقەرەوڵ بە هەر دێیەك یان ئاواییەك گەیشتبا ئەوا رایدەماڵی. خەڵك لە ترسان ماڵ و کاریان بەجێ دەهێشت و خۆیان دەشاردەوە. گرنگ نەبوو ئەو لەشکرە هاو زمان و خۆماڵیە، یان بێگانەیە، چونکە ئەمە، تەنیا شێوازو ئامرازێکی دابینکردنی پێویستی لەشکرکێشی بوو، بۆ هەموو لایەك. کۆمەڵە خەڵکێك پشتیان لە ژیانی نیشتەجێی و کشتوکاڵ کردو رویان لە بیابان نابوو، تا هەمیشە لە ژێر چەپۆکی لەشکرکێشی نەپلیشێنەوە. لە بەڵگەنامە ئاشووری و فیرعەونییەکاندا بە چاوێکی سوك سەیری ئەم خەڵکە کراوە و پێیان گوتراوە هاپیرۆ یان **خاپیرۆ**. هەندێ مێژوونوس وای بۆ دەچن کە مەبەست لە هاپیرۆ هەمان عیبریەکان یان ئیبراهیمیەکان و جولەکەکانی ئەمرۆبن، بەهەر جۆرێك بێت خاپیرۆ بە خەڵکە بێکەڵکەکە گوتراوە، هەروەکو چۆن خاپەرۆکیش بە بەشە خراپ و بێکەڵکەکەی شت دەگوترێ.

**چەرمەسەری/** هاوواتای کوڵەمەرگیە. واتا ژیانێکی زۆر سەخت و تاڵ و ناخۆش. چەرمەسەری لە دوو وشەی لێکدراوی چەرم و سەر پێکهاتووە. گەلۆ دەبێ چەرمی سەر چ پەیوەندیەکی بە ژیانێکی تاڵ و ناخۆش و بە ئازارەوە هەبێت، بۆ وەڵامی ئەوە دەبێ لاپەڕەکانی مێژوو هەڵبدەینەوە، تا بزانین چەرمی سەری مرۆڤی وڵاتی ئێمە چی پێکراوە تا ناخی مرۆڤ ئاوا بهەژێنێ و وشەکە بە نەمری و زیندویی بهێڵێتەوە. پاشاکانی ئیمپراتۆریای ئاشووری، لە زۆربەی ئەو بەڵگەنامانەی کە لێیان بە جێماوە شانازیان بە دڕندەیی و رەشەکوژی و بێبەزەیی خۆیانەوە کردووە. یەکێ لەو کارانەی کە لە تابلۆکانیان تۆماریان کردووە، بریتی بووە لە کەوڵکردنی چەرمی سەری دیلەکانیان بە زیندویی و لێگەڕانیان تا بەدەم ئازاری زۆرەوە گیانیان دەردەچوو. ئەمجۆرە ئازاردانە

ناخی مرۆڤی ئەو کاتی هەژاندووە، بۆیە وشەکە بە هەمان واتای خۆی لە زمانی کوردیدا ماوەتەوە.

**خەڵات**/ وشەی خەڵات لە زمانی کوردیدا لە جیاتی پاداشتوەرگرتن بەکار دێت، لە بری کارێکی ناوازە یان رۆڵێکی گرنگ، یاخود سەرکەوتن و بردنەوە لە خول و کێبەرکێ و رکەبەرێیەکدا. وشەکە لە بنەڕەتدا لە زمانی عەرەبی وەگیراوە و پەیوەندیشی بە نەریتێکی سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەیە. لە سەردەمی دەسەڵاتی عەباسیەکاندا، دواتریش شاکانی ئێران و میرە کوردەکان، خەڵاتکرادنی سەردارو سەرلەشکر و سەرۆکخێڵ و دەسەڵاتدارانی ناوچەیی باو بوو، وەکو پاداشی ئەو کارو خزمەتانەی کە کردویانە. خەڵات بریتی بوو لە بەخشینی دراو و زێر و ئەسپ. هەروەها دەرکردنی فرمانی دەسەڵات پێدان و بەرێوەبردنی ناوچەیەك. لەتەك ئەمانەدا، هەندێ کەس، وەکو رێزلێنانێکی پتر، خەڵاتێکی سومبولی تایبەتیان لە خودی پاشاوە پێدەدرا کە بەم جۆرە بوو. پاشا کەواکەی بەری (کە ئەو رۆژە بە تایبەت بۆ بەخشین دەیپۆشیێ) دادەکەنێ و لە رێورەسمێکی تایبەتیدا دەیخستە سەر شانی خەڵات وەرگرەکە بەم کارە دەگوترا (خەلعەت) کە وەك دیارە وشەکە عەرەبیەو واتای (داکەندن)ی جلوبەرگ یان رووتبوونەوە دەگەیەنێ، لەبەر نەبوون و دەرنەبڕینی پیتی (ع) لە زمانی کوردیدا، بەم کارە دەگوترا (خەڵات). بەم جۆرە وشەی خەڵات بەرە بەرە لە جیاتی پاداش بەکار هات و برەوی پەیداکرد.

**دایە**/ هەردوو وشەی دایك و باوك، لە زۆربەی هەرە زۆری زمانە هیندۆئەوروپییەکان، رەگی هاوبەشیان هەیەو لەیەکتری دەچن، دایك، لە گەلێ لە زمانە نا هیندۆئەوروپییەکانیش شێوەی گۆکردنی، لە شێوەی گۆکردنی زمانە هیندۆئەوروپییەکان دەچێ. لێکۆڵەوانی زمان لایان وایە وشەی دایك بەو زمانانە، لە گرۆگاڵی منداڵی ساوا وەرگیراوە (ماماماما. . . ) بۆیەشە بە دایك دەگوترێ، ماما، مامە، مۆمی، مۆم، یومە، ئومە و هیتر. . زۆر جار لە خۆم دەپرسی، بۆ ئێمەی کورد لەو رێسایە بە دەرین. باشە دایە لە چیەوە هاتووە؟ تۆ بڵێی بە زمانی میللەتێکی بنەڕەتی زاگرۆس وای پێگوترابێ و ئێمەش لەوانمان وەرگرتبێ؟. دوای تێپەڕ بوونی ساڵان، لە لایەکی هەرگیز چاوەڕواننەکراودا وەڵامەکەم دەست کەوت. لە زمانی سویدی، کە هەروەکو کوردی سەربەخێزانی زمانە هیندۆئەوروپییەکانە، بە کرداری شیر پێدانی بە

چکه یان ساوا لە لایەن دایکەوە دەگوترێ (ئامما Amma ). بەڵام ئەگەر گیانەوەرێك شیربە بەچکەکەی بدات، سویدیەکان پێی دەڵێن (دیە Dia). واتە وشەی (دیە) واتای شیر پێدان دەگەیەنێ. (دایە) ی کوردیش، وەکو چەندان وشەی تری، رەگهاوبەش لەگەڵ زمانە هاوخێزانەکانمان، لە هەمان فرمانی شیرپێدانی دایکەوە وەرگیراوە. سەیر دەکەین ئەگەر کەسێك شیر بە منداڵێکی ناتەنی (منداڵی خۆی نەبێ) بدات، ئەوا بە کوردی دیسان پێی دەگوترێ (دایان). دایانیش هەروەکو دایە لە فرمانی دیە واتا شیرپێدانەوە هاتووە. بەڵام ئێمە وشەی (مامان) مان هەیە. کە لەگەڵ وشە گشتگرە جیهانییەکەدا، هاو شێوەیە. وشەی (دایە) چ لە زمانی کوردی و، چ لە زمانی سویدیدا، فرمانی تری لێدروست کراوە. بە زمانی سویدی جگە لە فرمانی (دیە) وشەی (ge، یێ) هەیە کە واتای (بیدەیێ یان دان) دەگەیەنێ. (دیە) خۆی کاری شیردانە. بە هەمان شێوە. (دایە)ی کوردیش لە (دان) و شیرپێدانەوە هاتووە. واتا زمانی (دان) لەگەڵ (دایە) هاو رەگن. بۆ ئەوەی ئەمە باشتر بێتە بەرچاو، تێبینی قوتدانی پیتی (د) بکە لە بن زاراوەی ناوچەی بابان. بەم شێوەیە وشەی (دان) دەبێ بە (یان) یان وشەی (دای) دەبێ بە (یای) کە لە (یێ)ی سویدی نزیکتر بۆتەوە.

شیر پێدان لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپییەکان هاورەگن. لە زمانی کەونارای سانسکرێتیدا بە شیردان دەگوترێ (دایایتێ Dhayate). لە زمانی کۆنی جێرمانی (دیان)ە کە لە رەگی فرمانی (دان)ەوە هاتووە بە واتای شیر(دان). بە زمانی ئیتاڵی (دێییرن). بە رووسی (دویت) و سلۆڤێنی (دۆیتی) بۆ شیردان بەکار دێت.

دۆت/ لە هەندێ ناوچەی کوردستاندا بە واتای کچ بەکار دێت. دۆت لە هەندێ قسەی نەستەقی کوردی و پەندی پێشیناندا، وەك هاوواتای کچ بەکار هاتووە. دۆت لە زۆربەی زمانە هیندۆئەوروپییەکاندا دەربرینێکی نزیك لە کوردیەکە هەیە. بۆ نموونە دوختەر بە فارسیی دۆوتەر بە ئینگلیزی و پوگاتێر بە گریکی. بە زمانی سانسکرێتی پێی دەگوترێ (دوهیتار). رەگی وشەکە لە (دۆوگ Dhugh)ە وە هاتووە بەواتای (دۆشین).

**هەولێر**/ هەولێر، ناوی هەرە باوی ئەمڕۆی، شاری مێژوویی ئەربیلە بە زمانی دانیشتوانی شارەکە و دەوروبەری. ئەوەی جێگای سەرنجە، هەولێر، لە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی کۆن، یان سەدەکانی ناوەڕاست و درەنگتریش نەبیندراوە. هەموو ئەو

گەڕیدانەش کە بە هەولێردا ڕەت بوون، یان ناویان بردوە، هێمایەکیان بۆ وشەی هەولێر نەکردووە. کەچی بە پێچەوانەوە، ئەربیل وەکو ناوی شارەکە، لە سەرچاوەکانی پێش مێژوو و سەدەکانی ناوەڕاست دەبینرێ. گەڕیدە و نووسەرانیش شارەکەیان بە (ئەربیل) ناسیوە. لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ناوی ئەربیل بە چەند شێوەیەکی لێك نزیك هاتووە، وەك. ئەربێللا، ئۆربێللا، ئەربل، ئێربیل و ئەربیل. وشەی لێکدراوی (ئەربائیلۆ) درۆیەکی زەق و ساختەکاری سەرچاوە مێژوویی عەرەبییەکانی عێراقە، بۆ بەعەرەبی کردنی ناوی شارەکە و ناوچەکە، دەنا لە هیچ تابلۆیەك، یان دەقێکی مێژوویی کۆندا، چاومان بە (ئەربەعەئیلو) یان (ئەربائیلو) نەکەوتووە. ئێمە لێرەدا دەمانەوێ بزانین کە ئایا هەردوو وشەی ئەربیل و هەولێر واتایان چییە؟ و بە چ زمانێکن و سەرەتا چۆن گۆکراون؟. با لە سەرتاوە لە ئەربیلەوە دەست پێبکەین کە بەلای منەوە ناوە بنەڕەتیەکەی شارە. وشەی ئەربیل، وشەیەکی لێکدراوە و لە دوو بەش پێکهاتووە. هەردوو وشەکە بە زمانی کەونارای سۆمەرین.

پارچەی یەکەمی، یان وشەی یەکەمی ناوی شار بریتی بووە لە (ئور). وشەی ئور، لە زمانی سۆمەریدا واتای شار دەگەیەنێ. هەروەك لە ناوی شاری مێژوویی سۆمەرییەکاندا (ئور) یان لە ناوی شاری ئورۆك و (ئور شەلیم، شاری ئاشتی) دیارە. پارچەی دووەم، یان وشەی دووەم بریتیە لە (ئیل یان بیل) کە بە زمانی سۆمەری (خودا) دەگەیەنێ. ناوی خوودا یان ئیل بە سۆمەری لە ناوی خودای مەزنی سۆمەری (ئێنلیل)ەوە دیارە. ئێن واتای مەزن، پاشاو گەورە دەگەیەنێ. (لیل)یش بەخودا گوتراوە کە دواتر لە زمانی سامیەکان گۆکردنی گۆڕاوە، بۆ ئیل، ئیلا، ئیلات و ئەللا. ئیل لە زمانی ئارامیش بە فراوانی جێگای خۆی وەکو ناوی خودا کردۆتەوە هەروەك لە ناوە ئارامیەکانی ئیسرائیل، جوبرائیل، میکائیل و هیتر. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لە بنەڕەتدا بە شاری هەولێر گوتراوە (ئورئیل یان ئوربیل) کە (شاری خودا) دەگەیەنێ. بەم جۆرە گۆ کردنی (ئورئیل) بەرە بەرە بۆتە: ئوربیل، ئۆربیل، ئۆربیللا، ئەربل و ئەربیل. ئێستا نۆرەی ئەوەیە بزانین هەولێر چی بووە؟ لە بەر ئەوەی لە سەرچاوە مێژووییەکاندا، نە توشی ناوی هەولێر بووین، نە ناوێکی لە هەولێر چوش، بۆیە بەلای منەوە دەبێ هەولێریش هەر لە ئەربیلەوە هاتبێ و لە سەر زمان بەم شێوەیە گۆڕابێ. دەرخستنی

گۆڕانەکان، دەریدەخەن کە ئەمەش کارێکی ئەستەم نییە و دەبێ. گۆڕانەکان دەکرێ بەم جۆرە بسەلمێندرێ!

**ئەربیل – هەربیل – هەوریل – هەولیر و هەولێر.** جێگۆرکێی پیتەکانی (ل. و، ر) تا ئێستاش لە ناوچەی هەولێر، بەتایبەت لە دێهاتەکانی دەرەوەی شار، باوە. دەتوانین چەندان نموونە لە قسەی خەڵك بکەین بە بەڵگەی ئاساییبوونی جێگۆرکێی ئەو سێ پیتە وەك. (شەروال، شەلوار)، (مێرولە، مێلورە)، (دەروێش- دەورێش)، (هەوراز- هەرواز)، (دەوەرێ - دەرەوێ)، (دەدورێ - دەدروێ)، (قەروێلە، قەلوێرە)، (ئاریەل، ئالیەر) و زۆر نموونەی تری لەو چەشنەش. بە بەراورد لەگەڵ ئەو نموونانە (جێگۆڕکێی، سێ پیتەکانی. ل، و، ر) لە ناوی هەولێر، ئاسایی دێتە بەرچاو. لام وایە سەرەتا خەڵکی لادێکانی هەولێر، بەلایەنەوە زەحمەت بووە بڵێن ئەربیل و یەکەم جار لە سەر زاری ئەواندا ئەربیل بۆتە هەولێر. دەنا دانیشتوانی ناو شارەکە، تا درەنگانێکیش هەر بە شاریان دەگوت (ئەربیل). بە زۆربوونی کۆچی لادێیان، بۆ ناو شار، بەرە بەرە بەکارهێنانی هەولێریش بۆ ناوی شارەکە، بۆری بە ئەربیلداو پتر لە ناو شار بەکارهات. ئێستا خەریکە لای نەتەوە پەرستانی توندڕەو، هەولێر دەبێتە ناوە کوردیەکە، لە بەرامبەر ناوی کۆن و مێژوویی، ئەربیل، کە بەرە بەرە بە زمانی خەڵك ناناشنا دەبێت و وەکو ناوێکی بێگانە تێی دەڕەواندرێت. من هیچ گلەییەکم نییە ناوی لەسەر زار خۆشی هەولێر لای خەڵکی شارەکە بەکار بێت، بەڵام زۆر گرنگە (ئەربیل) وەکو ناوێکی نێونەتەوەیی، خاوەن قوڵایی مێژووی هەزاران ساڵ، دژایەتی نەکرێ و بپارێزرێ.

ناموس/ نامووس لە زمانی کوردیدا، بە واتای ڕەوشت و شەرەف بەکار دێت، ئەم وشەیە و پەیوەندی بە ڕەوشت، مێژوویەکی کۆن و سەیری هەیە. نامووس لە بنەڕەتدا، وشەیەکی زمانی گرێکییە. لە زمانی گرێکی (نەومۆس) بە واتای یاساو دابونەریتی گشتی، بەکار هاتووە، فەیلەسوفی ناسراو (فارابی) (٨٧٠ – ٩٥٠ ) زاینی وشەی نامووسی، لە جیاتی خوڕەوشتی باوی ناو کۆمەڵ بەکار هێناوە، وەك: چۆنییەتی گردبوونەوە لەسەر سفرەی نانخواردن، ڕاوکردن، چوونەشەڕ، جەژنگرتن، گۆڕانی و هەڵپەڕکێ و. . . هتد. فارابی لای وابووە کە نامووس، دەستوورە بۆ نەریتەکانی ناو کۆمەڵگا، هەروەك لە نامیلکە ناسراوەکەیدا (فەلسەفەی ئەفلاتون و بەشەکانی) هێمای بۆ کردووە. لە کۆمەڵگاکانی سەدەکانی ناوەڕاست زوتری ڕۆژهەڵاتدا، خەڵکی شارەکان،

توند توند بە پیشەکانیانەوە گرێدرابوون و بۆیان نەبوو پیشەوکاریان بگۆڕن. واتا نەدەکرا دارتاشێ ببێ بە ئاسنگەر، یان کورتاندروویێك ببێ بە جۆلاو بەم جۆرە. باوك، ئەرکی سەرشانی بوو کە کوڕەکانی فێری ئەو پیشەیە بکات کە خۆی دەیکرد، تا ئەوانیش هەمان پیشە بە میرات وەربگرن. هەر دەستەیەکی پیشەگەریش، سەرۆکێکی هەبوو، کە بەرامبەر دەوڵەت بەرپرسی کۆکردنەوەی باج بوو لە پیشەگەرەکانی، هاوکات چاودێری و پاراستنی پیشەگەرەکانی لە ئەستۆدا بوو. هەر دەستەیەکیش لەوانە کۆمەڵێك داب ونەریت و (نامووس)ی تایبەت بە خۆیان هەبوو. لادان لە نامووسی دەستەکە، بە نەنگی و بەدڕەوشتی دادەندرا. ئەگەر کەسێك بەوە تاوانبار بکرابایە کە لە نامووسی دەستەکەی خۆی لایداوە، ئەوا زۆر پەرێشان دەبوو. زۆر جار کەسە (بێناموسەکە) سزا دەدرا و لە دەستەکەی وەدەر دەندراو پیشەکەی لە دەست دەچوو. بۆیە دەبوو سەری خۆی هەڵگرێ و لە شارێکی تر، یان وڵاتێکی تر بژێوی خۆی پەیدا بکات. ئەگەرچی ئەمڕۆ، سەردەمی پیشەی داخراو لە ناوچووە و خەڵك ئازادن لە گۆڕینی پیشەکانیان. زۆر لە دابونەریتی پیشەییش باویان نەماوە، کە چی (بێناموس) و ناموس، لە فەرهەنگی زمانی کوردیدا، شوێنی خۆی کردۆتەوە و بە شێوەیەکی بەر فراوان و تا رادەیەکیش، بە هەمان واتا کۆنەکەی بەکار دێت.

**قەلەندەر**/ کەسێکی کەساس، کەسێکی بێکەس و لێقەوماو. بە کەسێکی بێجێگاو رێگا دەگوترێت. وشەی (قەلەندەر) لە بنەڕەتدا لە زمانی هیندیەوە وەرگیراوە. وشەکە بە زمانی هیندی (**کەلەندراس**)ە. کەلەندراس، دەستەیەك خەڵکی گەڕۆك و بێماڵن. بۆ دابینکردنی بژێویان، هەر جۆرە کارێك هەبێت، دەیکەن. تا ئێستاش ئەمجۆرە خەڵکە بە هەمان ناو لە هیندستان ماون.

**قەفقاس**/ ناوی زنجیرە کێوێکە، جاران سنووری باکووری دەوڵەتی ساسانی، جیادەکردەوە. ئێستاش سنووری وڵاتی رووسیایە لەگەڵ وڵاتانی ئازەربایجان، ئەرمەنستان و جۆرجیاو چەند وڵاتێکی تری بچووکتر. لە نووسراوەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا، ناوی ئەو زنجیرە کێوە بە کێوی (**قاف**) هاتووە، وشەی (**کاس**) بە زمانی خەڵکی ناوچەکە کێو دەگەیەنێ. کەواتە کێوی قافی مێژوویی، ئێستاش هەر قاف یان کافە بە گۆڕانی پاشگری کێو بۆ زمانێکی ناوچەیی کاف + کاس یان قاف + قاس بەسەریەکەوە دبێتە کافکاس یان قەفقاس.

**قرمز**/ بە رەنگی سووری کالّ دەگوترێ. ناوی رەنگی قرمز پەیوەندی بە پیشەیەکی زۆر کۆنی ناوچەکەمانەوە هەیە. جاران خەچیّتی و ئامادەکردنی رەنگ، پیشەیەکی باوو بەربلاو بوو، بۆ رەنگکردنی پارچە قوماش و جلوبەرگ، کە بازاری بە برەو بوو. زۆربەی رەنگەکان راستەوخۆ لە سروشتەوە وەردەگیران. رەنگی سوور لە ناوچەکانی وان و هەکاری و خوی و ورمیّ، لە کرمەسوور دروستدەکرا. خەلّکی لادێکانی ئەو ناوچانە، هاوینان روویان لە دەشت ودەرکردو بە هەزاران کرمیان کۆ دەکردەوە. کرمەکان دەفرۆشرانە خەچیان. ئەوانیش، ئەو کرمانەیان لە ناوی کولاّو دەهاویشت. ئینجا دەیانگوشی تا ئاوێکی سووری کالّی لێبەدەست دەهات. ئاوەکە بۆ رەنگکردنی پارچە و قوماش بەکار دەهات، بە رەنگی سووری کالّ کە داواکاری لەسەر زۆر بوو. خەلّك بەو رەنگەیان دەگوت **کرم** + **مس**. وشەکە بەرە بەرە لەسەر زاران بوو بە **قرمز**. تەیموری لەنگ، کاتێك کە دەیەویست لە شاری خوی بۆ مەرەند بچێت، پێشقەرەولان هەوالّی بۆ دێنن کە لەشکرێکی گەورە لە پێشیانە. زۆر نابا هەوالّی تری بۆ دێت کە ئەمانە خەلّکی ناوچەکەن و خەریکی کۆ کردنەوەی کرمی سوورن کە بۆ دروست کردنی رەنگی سوور بەکاری دێنن. تەیمور، ئەم بابەتەی بە سەرنجڕاکێشانەوە لە یادەوەریەکانی تۆمار کردووە.

**قۆرخانە**/ لەسەردەمی میرنشینە کوردییەکاندا. وشەی قۆرخانە بۆ باروتخانە بەکار دەهات. ئێستاش ناو بە ناو لە هەندێ نووسیندا قۆرخانە دەکەوێتە بەرچاو. وشەی قۆرخانە بۆ سەردەمی تەیموری لەنگ دەگەڕێتەوە. لە سەردەمی تەیموردا، لەشکرەکەی، یەکە یەکی تایبەتی باروتسازی هەبوو.          بەسەر دەستەی ئەو یەکەیە دەگوترا (قۆرخان) یان (گۆڕخان). دوای ئەمە قۆرخانە بۆ باروتخانە بەکار هاتووە.

**قەرەج**/ میللەتێکی گەڕۆکن. لەسەر روبەرێکی پانی ئاسیا و ئەوروپا بلاّوبوونەتەوە. زۆر یان گەڕۆکن. بە فالگرتنەوە و بازرگایکردن بە ئەسپ دەژین. قەرەجەکان لە بنەڕەتدا دانیشتوی دۆلّی سند بوون کە دەکەوێتە ناو خاکی پاکستان. لە سەردەمی سولّتان مەحمودی غەزنەوی، ئازار دران و بە زۆر زبارەیان پێدەکرا و ناچار دەکران تا ئاینیان بگۆڕن. ئەوانیش بە چەند شەپۆلێك ولاّتی خۆیان بەرەو رۆژئاوا بە جێهێشت و شێوە ژیانێکی تریان هەلّبژارد. لە ولاّتانی جۆراو جۆر، ناوی جۆراو جۆریان لێنرا وەك (کاولی، کێوەلی، تسیگان، جیپسی، غەجەر، سێنەرێ) بە کوردیش پێیان دەگوترێ قەرەج. قەرەجی کوردی لە قارەچی تورکی وەرگیراوە کە واتای پێست رەش دەگەیەنێ.

**ئۆردوگا – ئۆردی/** ئۆردوگا لە زمانی کوردیدا، بە شوێنێکی کاتی تێدادا ژیان دەگوترێ. لە ٢٥ ساڵی رابوردوودا، ئۆردوگا دورنەمایەکی رامیاری وەرگرت. شوێنی بە زۆر کۆکردنەوەی خەلکە، تا لەژێر چاودێری دەوڵەتدا بژین. وشەی (ئۆردی)یش، واتای سەربازخانە دەگەیەنێ. هەردوو وشەکە لە بنەڕەتدا لە زمانی تاتاری وەگیراون. (یورت) یان (یورتگا) بە پاشگری (گا) کە بە کوردی جێ دەگەیەنێ، بریتی بوو لە هۆبەو هەوارگە. تەیموری لەنگ، کە شارێکی داگیر دەکرد، لە قەراغ شاردا (یورتگا)ی خۆی و لەشکرەکەی دادەنا. چونکە خەڵك تەنیا سەربازو شەڕکەریان دەبینی لە یورتگا، بۆیە یورتگا لە بری سەربازخانە کەوتە ناو زمانەوە. وشەی یورت، لەسەر زار بە ئاسانی گۆڕا و بوو بە: یورت، ئۆرد، ئۆردی و ئۆردوگا.

**ترنج/** لە هەندێ دەقی فۆلکلۆری کوردیدا، شان بە شانی نارنج و لیمۆ، ناوی ترنجیش وەکو میوە دێت. ئایا دەبێ ترنج بە چ میوەك بگوترێ؟ تەیموری لەنگ، لە گەشتی سەربازیی خۆیدا، بۆ ناوچەی تەبرستان، دەنووسێ کە ناوچەکە داری نارنج و ترنگی لێبوو. لەسەرچاوە عەرەبیەکاندا ترنگ بە گرنج تۆمارکراوە و وەکو ناوی پرتەقال هاتووە، نارنجیش جۆرێك لیمۆیە.

**مەکحول/** مەکحول لە زمانی کوردیدا، واتایێکی تایبەتی نییە. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە کە مەکحول ناوی زنجیرە شاخێکی نزمە کە وەکو درێژ بووەوەی شاخی حەمرین، لە رۆژاوای حەمرینەوە دەکشێ. وشەکە پەیوەندی بە جۆرە سزادانێکی سەخت و نامرۆڤانەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە هەیە. جاری وابوو پاشاو دەسەڵاتداران، لە جیاتی کوشتن، بڕیاری کوێرکردنیان دەدا، تاکەسە کوێرکراوەکە بە درێژایی ژیانی، هەمیشە ئازار بکێشێ و لە تاریکیدا بژیێ. چاو کوێرکردن زۆر جۆری هەبوو. جۆرێکیان بە وەستای تایبەتی جێبەجێ دەکرا. کە پێیان دەگوت (مەکحول). جەللاد، لەم بارەیاندا، شیشێکی زۆر باریکی داخکراوی لە بیلبیلەی چاوی کەسەکە رادەکرد و سوورمەی چاوی دەرِشت. سزادراوەکە دوای چاکبوونەوەی برینی چاوی، وەکو چاو ساغ دەردەکەوت، بەڵام بۆ هەمیشە لە تاریکیدا دەمایەوە و چاوی نەیدەبینی. بەم کارەیان دەگوت (مەکحول) کردنی چاو، چونکە بریتی بوو لە کێشانی سوورمەی چاو یان (کحل، کل)ی چاو کێشان. واتا مەکحول لە کل دەرکێشانی بیلبیلەی چاوەوە هاتووە. کە کوێرکردنێکە، بێنەوەی شوێنەواری دیاربێت.

**وجاخ**/ یان وجاخ، لە زمانی کوردیدا (بە واتای نەوە و منداڵ لێکەوتنەوە دێ. زۆر جار گوێمان لێدەبێ کە لە پاداشتی کاری چاك دەگوترێ (وجاخت کوێر نەبێتەوە) یان پێچەوانەکەی کە نزایەکی زۆر توندە (وجاخت کوێر بێ !). وشەی وجاخ لە بنەڕەتدا، کاری پاراستنی ئاگر بووە تا نەکوژێتەوە، دیارە جاران ئاگرکردنەوە بۆ خۆگەرمکردنەوە یان خواردن دروست کردن، کارێکی زۆر ئاسان نەبووە، بۆیە لە دێ، یاخود لە هۆبە و هەواران، دەبوو بە نۆرە کەسێك ببێ بە وجاخ تا مانەوەی ئاگر مسۆگەر بکرێت، هەمان کار لە ئاتەشگەدەکانیش پێڕەو کراوە. وجاخی ئاتەشگەدە، جلوبەرگی سپیی ئاینی لەبەر بووە. داری پیرۆزی خستۆتە سەر ئاگرێکی پیرۆز، بۆ ئەو مەبەستەش دەبوو دەمولوتی داپۆشێ، نەوەکا بەهەڵمی دەمی ئاگری پیرۆز پیس بێت. زۆرجار وشەی وجاخ لە بری ئاگردانیش بەکارهاتووە. دەربڕینی (وجاخت کوێرنەبێتەوە) واتا ئاگردانت خامۆش نەبێت و نەکوژێتەوە.

**عەرەبانە**/ بە هەموو جۆرە گالیسکەیەك دەگوترێ، جا بەدەست رابکێشرێ، یاخود پاڵ بدرێت یان ئەسپ رایبکێشێ. لەبەر ئەوەی وشەی (ئەڕابە) لە عەرەبانە کۆنترە و لە سەرچاوە مێژووییەکاندا تۆمارکراوە، بۆیە دەبێ عەرەبانە لە ئەرابەوە هاتبێ. تەیموری لەنگ دەنووسێ بۆ یەکەمجار لە پەلامار بردنە سەر شاری بەغدا توشی (ئەڕابە) بووم کە بە چوار ئەسپ رادەکێشراو لە مەیدانی شەڕدا بەکار دەهات.

**سوپاس**/ وشەی سوپاس، دەربڕینی هەست و پێزانینی کەسێکە بەرامبەر بە چاکەی کەسێکی تر. سوپاس لە بنەڕەتدا لە زمانی رووسیەوە وەرمانگرتووە. هەروەها وشەکە بەرگێکی ئاینی هەبووە و بریتی بووە لە نزاناردن وەك دەربڕینی پێزانین بەرامبەر بە چاکەی کەسێك. وشەی سپاس، بە زمانی رووس پێیدەگوترێ (سپاسیبا) کە لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە (سپاس) واتا رزگارکردن یان نەجات دان، هەروەها(با) کە لە بنەرەتدا کورتکراوەی بۆگە کە خودایە. هەردوو وشەکە بەسەر یەکەوە دەبێ بە: خودا نەجاتت بدات.

**سەماوەر**/ ئامێرێکی زۆر ناسراوی ئاو گەرمکردن و چالێنانە. جاران لە زۆربەی ماڵە کوردان و دیوەخانەکاندا هەبوو. سەماوەر لە دوو وشەی لێکدراوی زمانی رووسیەوە وەرگیراوە! سام واتا لە خۆیەوە یان ئۆتۆماتیك **ئاوەر** واتا گەرم بوون. هەردوو وشەکە بەسەر یەکەوە دەبێ بە (لە خۆیەوە گەرم دەبێت).

**شفره یان جفره/** کلیلی داپۆشینی دەقێك یان برووسکەیەکە بە شێوەی رازو نهێنـی. وشـەی شـفره یـان جفـره لـە بنەڕەتـدا رۆژهـەڵاتی و خۆمانەیـە، بـەڵام بـەو مەبەسـتەی سەرەوە، لە زمانی ئینگلیزیەوە وەرگیراوە. وەك مێژوونووسان باسیان کردووە، کاتێ کـە عەرەبەکان وڵاتی ساسانیان گرت، بەردەوام بوون لە نووسین و راگرتنـی دەفتـەری بـاج و خەراج بە زمانی فەهلەوی، چونکە زمـانی عـەرەبی کـەموکوڕی زۆری هـەبوو، لەوانـە نەبوونی هێمای تایبەت بوو بۆ ژمـارە. زمـانی فەهلـەوی شـێوە ژمـارەی لـە هیندیـەوە وەرگرتبوو و بەکاری دێنا. عەرەبەکان بە زوویی لە گرنگی هێما ژمارەییـەکان گەیـشتن و پێیان باش بوو کە ماتماتیکزانە موسوڵمانەکان ژمارەکانیان هێنا ناو نووسینی عـەرەبی. دوای جێگیربوونی موسـوڵمانان لـە ئەنـدەلوس، ئـەوروپیانیش ئاشـنایەتیان لەگـەڵ ئـەو ژمارانە پەیدا کرد، کە موسوڵمانان لەگەڵ خۆیاندا هێنابویانە ئەنـدەلوس. ئەورووپییـەکان بە خێرایی بۆیان دەرکەوت کە ئەو ژمارە تازانە، واتا ژمارەکانی ١ — ٩ و هێمـای سـفر (٠) زۆر پراکتیـکین بۆ نووسین و ژمارە و پێوان بە بـەراورد لەگـەڵ ژمـارە رۆمانییـەکان، کە لە دەستەو لك و تیپی سەربازی وەرگیرا بوون. لەبەر نـەبوونی ژمـارە، ئـەوروپیان تـا سەردەمی رێنیسانس زانستی ماتماتیکیان نەبوو. هەر بۆ بەراوردکاری: ژمارە ١٨٨٨ بە رۆمانی بەم چەشنە دەنووسرا (MDCCCLXXVIII ). واتـا لـە جیـاتی چـوار هێمـا، سێزدە هێما پێویـست بوو. خستنە سەر یان لێکدەرکردن و چـەندجارە کردنێکـی سـادە، پێویـستی بـە لاپەڕەیـەك هـەبوو، گەرچـی هێـشتا ئـەو کـات پیـشەسازی کاغـەز دروستکردنیش نەگەیشتبووە ئەورووپا.

ئەوروپیان بە ژمارە ١ تا ٩ یان دەگوت فیگور یان شـێوە، بـەڵام بـە ژمـارە سـفریان دەگوت (Ceppirum) یان ژووری بەتاڵ، هەروەك لە بنەڕەتدا سفر بە زمانی هیندی ئاوا دەگەیەنێ. ئەوروپیان زوو هەستیان کرد کە رۆڵی سفر لە رۆڵی سەرجەم نۆ فیگورەکـانی تر جیایە. تەنانەت وەکو جادوگەرێك نرخ و بەها بۆ شێوەکانی تری ژمارە دادەنێ. سفر، بە خێرایی کەوتە ناو زۆربەی زمانە ئەوروپیەکان، بە شێوەی ( cipher, siffra, ziffer, chiffra). کاری جادوناسای ژمارە سفر، وای لە ئینگلیزەکان کـرد، وشـەی (chiffra) لە جیاتی راز پاراستن بەکاربێنن. بەم جۆرە هـەر سـفرە کۆنەکـەی لای خۆمـان بـە نـاوی شفره یان جفره و بە بەرگێکی تازەتریش هاتۆتەوە.

**لۆگاریتم/** تێرمی ناسراوی لۆ کاریتم، له زانستی ماتماتیکدا، سەربوردەکەی لەو پەڕی رۆژهەڵاتەوە دەست پێدەکات، ماتماتیکزانی گەورە (ئەلخوارەزمی) نووسینەکانی له بواری ماتماتیك و ئەندازە، لای زانا موسوڵمانەکان ناسراو و رێز لێگیراو بوو. کتێب و نووسراوی ئەلخوارەزمی لە ئەندەلوس پلە و پایەی تایبەتیان هەبوو. کتێبەکە لە سەرەتای (١١٥٥) زایینی لە ئیسپانیا کراوەتە لاتینی، وەرگێڕی کتێبەکە ناوی ئەلخوارەزمی دانەری کتێبی بەم جۆرە لەسەر بەرگەکەی نووسیوە (Algaritmi).

دواتر ئەو تێرمەی کە لەو کتێبە وەرگیرا، هەر بە ناوی ئەوەوە ناوبانگی دەرکرد. بەڵام ئەمجارە ئەلخوارەزمی لە (Algaritmi ) یەوە بوو بە ( logaritmi) و دواتریش تەنیا (logaritm) یان لۆگاریتم.

**ئاوقات/** ئاوقات بە کەسێکی قسەزان و لەبلەبان دەگوترێ کە هەم دەتوانێ قسە بکات و هەم دەشوێرێ هەڵوێست دەربڕێ.

لە هەندێ باردا ئاوقات بۆتە نازناوی هەندێ کەس، وشەی ئاوقات لە ( Advokat ) ئەدڤۆکاتی لاتینییەوە هاتووە کە بە پارێزەر دەگوترێ. ئەدڤۆکات زۆر بە بەربلاوی لە زمانە ئەورووپییەکان بەکار دێت، دیارە وشەکە بە شێوە گۆکردنی ئاوقات, لە رێگای زمانی تورکیەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردی خۆ خراپیش نییە گەر ئێمە ئاوقات یان ئەدڤۆکات لە جیاتی پارێزەری لە عەرەبی وەرگێڕدراو بەکار بێنین.

**بەگزادە/** واتا کەسێکی خانەدان، کەسێك کە سەر بە بنەماڵەیەکی ناسراو بێت. کەسێکی شارستانی و خاوەن دابوونەریتی شارستانیانە، کەسێکی دەوڵەمەند و خواپێداو. وشەی بەگزادە، پەیوەندی بە (بەگ)ی مەغۆلیەوە نییە و زۆر زۆر لەوە کۆنترە. بەگزادە بۆ پێش سەرهەڵدانی ئاینەکانی میترایی و زەردەشتی دەگەڕێتەوە. واتا بۆ سەردەمانێك کە ئێمەو میللەتە سلاڤیەکان، هێشتا خودای بۆگمان دەپەرست. وشەکە لێکدراوە و لە دوو پارچەی بۆگ + داد پێکهاتووە، بە تێپەڕبوونی کات وشەی بۆگداد بەم گۆڕانانەی خوارەوەدا تێپەڕیوە: بۆگداد — بەگداد — بەگ ژادە — بەگ زادە، لێرەدا دوو تێبینی زۆر پێویستن تا لەم گۆڕانکاریانە بگەین، گۆڕینی پیتی (ژ) بۆ (ز) لە زمانی کوردیدا، سەردەمێکی زۆری بەسەردا تێنەپەڕیوە، لە بەڵگەنامە بەجێماوەکانی سەردەمی ساسانیدا توشی گەلێك وشە دەبین کە پیتی (ژ) یان تێدا بەکارهاتووە و ئەمڕۆ ئەو پیتانە لە هەمان وشەکاندا بە (ز) دەخوێندرێتەوە، واتا

گۆڕانی بەگژادە بۆ بەگزادە، لە چوارچێوەی ئەو گۆڕانە زمانەوانییەدا بووە. تێبینی دووەم ئەوەیە کە وشەکە لە سەرەتاوە واتای (خواپێداو)ی گەیاندوە، یان (خوابیداتیێ) مەبەست لەمەش کەسێکی زەنگین و دەوڵەمەندە. ئێستاش بە زمانی رووس وشەی دەوڵەمەند پێیدەگوترێ (بەگاتیێ) کە لە بۆگ داتیێ هاتووە. بۆگ لە بنەڕەتدا واتای (خوابیداتیێ)یە. وشەی (دات)ی رووسی هەمان (دان یان پێدان) ی کوردیە.

**ژین**/ ژین یان ژیان واتا زیندو و گیان لەبەر. پێچەوانەی مردوو بێگیان، وشەی ژین، لە زمانی کوردی و چەندان زمانی هیندۆئەورووپی تردا، سەرچاوەکەی سەرنجراکێشە. دوای بەراوردکردنی چەندان زمان، بۆم دەرکەوت کە ژیان لە وشەی (ژن)ەوە داتاشراوە. هۆکەی روون و دیارە. مرۆڤ هەر لە کۆنی کۆنەوە بینیویەتی کە ئەمە ژنە ژیان بە بوونەوەرێکی تازە و نوێ دەبەخشێ و دەیبێ، هەر بۆیەشە بوون و مان و زیندوویی و ژیانی ساواو کۆرپەلە، بە بوون و مان و ویستی ژنەوە گرێدراوە. هەمان پەیوەندی نێوان ژین و ژن، لە چەندان زمانی هیندۆئەورووپی تردا بە ئەندازەی زمانی کوردی روون و ئاشکران بۆ نموونە لە زمانی فارسیدا بۆ هەردووکیان دەگوترێ زیندەگی و زەن. لە زمانی رووسیدا دوو وشەکە دەبنە ژیزن و ژێنە.

**قۆدیك**/ بە شێوەزاراوەی کرمانجی بۆ ئاوێنە بەکار دێت. هەندێ نووسەر لایان وایە کە قۆدیك یان قۆدیلك لە قۆدی و قوتیەوە وەرگیراوە. ئەم لێکدانەوەیە وردبوونەوەی زۆری بۆ نەکراوە. هەروەها لە دەقە کلاسیکیەکانیشدا بە دوایدا نەگەڕاون. قۆدیك لە بنەڕەتدا بریتی بووە لە خۆدیك کە وشەیەکی لێکدراوی کوردیە و لەم دوو وشەیە پێکهاتووە: خوە + دی کە واتای (خۆی دیت) دەگەیەنێ. خوە دی بە تێپەڕبوونی کات بۆتە خۆدی – خۆدیك – قۆدیك.

**سەگ**/ رەنگە خوێنەر بیر لەوە بکاتەوە کە گەلۆ دەبێ وشەی سەگ چ نهێنییەکی تێدا بێت تا لە رووی ئیتمۆلۆجییەوە لێی بکۆڵدرێتەوە. سەگ یەکێ لەو وشە دەگمەنانەی زمانی کوردییە کە دەتوانین تا ۲۷۰۰ ساڵ پێش ئێستا بەدوایدا بچین و ببینین کە چ گۆڕانێك بەسەر ئەم وشەیەدا هاتووە، کۆنترین بەڵگەنامە کە هێمای بۆ سەگ کردبێت، ئەوا تابلۆیەکی قوری سەردەمی سەنکاریبی (۷۰۵- ٦٨١ پ. ز) پاشای ئاشوورە. لەو تابلۆیەدا سەرۆك خێڵێکی کوردستان ناوی بە(سەگ) تۆمار کراوە. لە تابلۆکەدا ناوی سەرۆك خێڵەکە بە(ئیسپاکە) هاتووە. هەمان ناو لە بەڵگەنامەیەکی تردا

بە(**سپاکە**) هاتووە. وشەی سپاکە بە تێپەڕبوونی کات بۆ **سەباکە** گۆڕاوە. تا ئێستاش بە زمانی رووسی بە سەگ دەگوترێ سەباکە. دوای ئەمە گۆڕانەکان دیارن. بە تێپەڕینی کات پاشگری (یاکە) یان هەندێ جار تەنیا (یا)ی لێ قرتاوە و وشەکە وەك سە یان سەگ ماوەتەوە. لە باڵەکایەتی سەگ رێچکەیەکی نەختێ جیاوازی بڕیوە و بووەتە کسۆك. کسۆك لە دەڤەری باکووری کوردستان دەبێ بە کوچك.

**بەرباد**/ بەواتای شتێکی تەواو بێکەڵك و لە کارکەوتوو کە چیتر بەکار نایەت. کۆن و داڕزاو. مێژووی ئەم وشە لێکدراوەیە لەناو زمانی کوردیدا زۆر کۆن نییە. وشەی بەرباد لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، واتا لەگەڵ هاتنی ئینگلیزەکان بۆ باشووری کوردستان، لە زمانی کوردیدا جێگای خۆی کردۆتەوە و کەوتۆتە سەر زمانی خەڵك. بنەڕەتی وشەی بەرباد بریتییە لە (Very bad، ڤێری باد) کە واتای (زۆر خراپ) دەدات. دیارە ئەوانەی دانوستانیان لەگەڵ ئینگلیز هەبووە، وشەکەیان بەشێوەی **بەری باد** وەرگرتووە و بە تێپەڕینی کاتیش بووەتە **بەرباد**. بەرباد نموونەیەکی چاکی گونجاندن و توانەوەی وشەی وەرگیراوە لە زمانێکی تردا.

**مێرەم**/ ناوی تاکی کەسی مێیەیە لە زمانی کوردیدا. لە دوای بڵاوبوونەوەی ئاینی مەسیحی لە کوردستاندا، ناوی مێرەم لەگەڵ ناوی ماری یان مریەمی دایکی عیسای مەسیح ئاڵوگۆڕی پێکراوە و لای خەڵك وا دەزاندرێ مێرەم بە کوردی کراوی ناوی ماری یان مریەمە. لە راستیدا مێرەم ناوێکی کۆنی پێش سەرهەڵدانی مەسیحیەت و تەنانەت پێش پەیدابوونی ئاینی زەردەشتیشە. مێرەم لە دوو وشەی لێکدراوە پێکهاتووە بەم جۆرە/ (مهر + رام) کە واتای ملکەچی میهر دەگەیەنێ. وشەکە بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانێکی کەمی بەسەر هاتووە بەم شێوەیە/ (میهررام _ مێررام _ مێرام _ مێرەم).

**پنت**/ پنت وشەیەکی زۆر کۆنە و لە زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپییەکان هەیە بەکەمێ گۆکردنی جیاوازە وەکو (پۆینت). پنت یان پۆینت واتای خاڵ یان خاڵێکی بچووك دەگەیەنێ ، وەك ئەو خاڵەی کە لە دوای رستەی تەواودا دادەنرێ. پنت لە زمانی کوردیدا، وشەیەکی تریشی لێ داتاشراوە کە پندە. پند، زیندەوەرێکی بچووکی وەك خاڵ وایە و لەسەر مژینی خوێنی باڵندە و گیانەوەر دەژێت.

**بازنگ**/ ئەو بەشەی باڵی مرۆڤە کە دەست و ئەنیشك بەیەکەوە دەگەیەنێ. بازنگ بە بازووش ناو دەبرێت، هەروەك دەگوترێت دەستوبازوی بەهێزە. دیسان بازنگ بە زەندیش ناوی هاتووە. ئەوەی بۆ ئێمە گرنگە وشەی بازو یان بازنگ، چەند وشەیەکی تریشی لێ داتاشراوە لە زمانی کوردیدا. یەکێ لەو وشانە (بازن)ە، کە دەخرێتە بازو یان بازنگەوە، بە تایبەت ژنان وەك و خشڵ بازن لە دەست دەکەن. دیسان بازنەمان هەیە کە هێڵێکی خڕی داخراوە لە شێوەی بازنی دەست.

**پەنجە**/ لە زمانی کوردیدا، ئەنگوست، تل، پلو پت بەکار دەهێندرێت. پەنجە لە بنەڕتدا لە ژمارە (پێنج،٥) وەرگیراوە، چونکە ئەنگوستەکان هەریەکێ لەدوو دەستەکەو پێیەکان ژمارەیان پێنج دانەیە.

هەورامان/ هەورامان ناوی هەرێمێکی شاخاوی زۆر گرنگ و ناسراوی کوردستانە. ناوەکە بە چەند شێوەیەکی وەك هەورامان، هۆرامان، ئۆرەمان و ئورەمانات تۆمارکراوە. وشەی هەورامان لە دوو وشەی لێکنراوی کۆنی زمانی کوردی پێکهاتووە کە بریتین لە (هۆر+رمان)، هۆر هەمان خۆر یان رۆژە، رمانیش دارِمان و شۆڕبوونەوە و ئاوابوون دەگەیەنێ. بەسەر یەکەوە هەورامان واتا (خۆر ئاوابوون) یان (خۆر کەوتن). هەورامان وەکو لای رۆژئاوا، لە بەرامبەر (خۆراسان یان خۆر راسان) کە دەکەوێتە لای رۆژهەلات، هاتووە. وشەی راسان لە زمانی ئینگلیزی بە شێوەی (rice رایس) بۆ هەڵهاتنی رۆژ هەر بەکار دێت.

**ئەڵقە لە گوێ**/ وشەی ئەڵقە لە گوێ، لە زمانی کوردیدا واتای بەکرێگیراو و خۆفرۆش وخیانەتکار دەدات. وشەی لێکدراوی ئەڵقە لە گوێ لە دابوونەریتێکی مێژوویی زۆر کۆنەوە بۆمان ماوەتەوە. لە سەردەمی دەسەلاتی ئیمپراتۆریایە کۆنەکاندا، میرە ناوچەییەکان دەبوو ملکەچی خۆیان بۆ ناوەند و پاشا مسۆگەر بکەن بەوەی کورێکیان وەکو بارمتە لە پایتەخت بێت. جگە لەمە هەندێ کاری سیمبولیش ئەنجام دەدران، یەکێ لەو کارە سیمبولیانەی کە جێبەجێ دەکرا، بریتی بوو لە سمینی گوێی میر و تێکردنی ئەڵقەیەك، تا هەمیشە بە لەرینەوەی ئەو ئەڵقەیە، میر ملکەچی خۆی بە بیر بێتەوە بۆ پاشا. لە هەندێ بەڵگەنامەی ساسانیدا هاتووە کە جار جار میرێکی ناوچەیی بۆ تەیسەفون بانگکراوە تا ئەڵقەی ملکەچی لە گوێ بکەن و دەسەلاتیشی بۆ تازە بکەنەوە. هەروەها کە بەوردی سەرنج لە هەندێ تابلۆیی قورینی سەردەمی کۆن

دەدەین، دەبینین کە ئەو میرانەی بەرێز وەستاون بۆ ئەوەی دیاری پێشکەش پاشا بکەن، ئەمانە ئەڵقەی گوێیان بە روونی کێشراوە وەك ئەوەی پێمان بڵێن ئەمانە ئەڵقە لە گوێ و ملکەچی پاشان. دیاردەی ئەڵقە لە گوێ لە سەردەمی ئیمپراتۆریایە کۆنەکانی پێش زاین زۆر کۆنترە. مـن لام وایـە بـۆ ئـەو سـەردەمانە دەگەڕێتـەوە کـە پیـاو لـە کۆمەڵـدا بـوو بەدەسەڵاتدار و سیستەمی پاتریارکی یان باوکسالاری بناغـەکانی چەسپان. ئـەو کاتانـە بوو پیاو، وەکو کارێکی سیمبولیك، ژنی ناچار کردووە تا ئەڵقە لە گوێی ئەو بێـت. واتـا ئەڵقەی گوێی ژن لە سـەرەتادا ئەڵقەی ملکەچی بووە. دیارە بە تێپەڕبوونی کـات، ئەڵقـە بووەتە گوارە و وەکو خشڵ بـۆ خۆڕازاندنـەوە بـەکار هـاتووە، بـەڵام دەربـڕینی کۆنینـەی (ئەڵقە لە گوێ) هەر بەواتا کۆنینەکـەی خـۆی لـە زمـانی کوردیـدا ماوەتـەوە، هـەر لـە زمانی کوردیدا دەربڕینی (وەکو ئەڵقە بیکە گوێت) واتا هەرگیز لە بیری نەکەیت.

**ئاڵتون کۆپری**/ بە واتای (پردی زێڕین) دێت. ناوی بە تورکیکراوی شاری (پردێ)یە، نووسەری جیا جیـا، روونکردنـەوەی جۆراوجۆریـان لەسـەر ئـاڵتون کـۆپری نووسـیوە. بـە تورکیکردنی ناوی شارەکە، بۆ سەردەمێکی دەسەڵاتی تورکانی عوسمانی دەگەڕێتەوە کـە بنکەیەکی سوپاییان لە پەنا پردی شارەکە دانا بـۆ پاراسـتنی. بنکەکـە بەشـێك بـوو لـە بنکەکانی پاراستنی رێگای ئاسـتانە- بەغـدا، کـە ئێـستاش پاشـاوە ئەتنۆگرافیەکـەی، وەکو هێڵێك لەسـەر سێکوچـکەی سـنووری تورکیـا- سـووریا- عێراقـەوە بـەرەو بەغـدا دەکشێ. کە تورکەکان لە پردێ نیشتەجێبوون، ویستویانە ناوی شـارەکە تۆمـار بکـەن و لە خەڵکی شاریان پرسیوە کە ئـاخۆ شـارەکەیان نـاوی چییە؟ ئـەوانیش گوتویانـە نـاوی (پردی زاب)ە. تورکەکان ویستوویانە ناوەکەی بگۆڕن بۆ تورکی. وشـەی پـرد بـە تـورکی (کۆپری) پێدەگوترێ، بەڵام لە وشەی (زاب) نەگەیشتوون و نەیانزانیوە ناوی رووبارەکەیـە و شارەکەش بە ناوی رووبارەکە کراوەتەوە. لایان وابووە کە کورد پیتی (ژ)ی عـەرەبی بـە (ز) گۆ دەکەن و دەبێ (زاب) (ژهب) واتا زێڕ بێت، بۆیە ناوی (پردی زاب)یـان بـە هەڵـە کردووەتە تورکی و پێیان گوتووە (ئاڵتون کۆپری)، پردی زێڕ یان پردی زێڕین.

رۆم/ رۆم لـە زمـانی کوردیـدا مەبەسـتێکی دوور و یـەکێکی تـری نزیکـی هەیـە. مەبەستی دوور و مێژوویی رۆم، بریتییە لە ئیمپراتۆریای رۆم یـان رۆمـانی کـە دەکرێتـە سێ قۆناغ. دەوڵەتی رۆمانی کۆن (٧٥٣- ٥٠٩ پ. ز). کۆمـاری رۆمـانی (٥٠٩- ٢٧ پ. ز) هەروەها ئیمپراتۆریای رۆمانی رۆژهەڵات، بیـزەنتی (٢٨٤- ١٤٥٣ ز) کۆمـاری

رۆمانی و رۆمە بێزەنتینییەکان، بۆ سەدان ساڵ لە باکوورەوە، هاوسنووری کوردستان بوون، هاوسنوورییەك پڕ لە شەڕ و پەلامار و لەشکرکێشی و بەرەنجامەکانیشی دیارە بریتی بووە لە کوشتار و تالان و راکردن و راگواستن و مالوێرانی. دیارە هاوسێیەتی نا، بەلکو شەڕ و کوشتار و ترس و دڵەڕاوکێ، ناوی رۆمانی لە بیری خەلکی کوردستان بە نەمری هێشتوتەوە. ئێمە تا ئێستاش بەسەر زەوی کۆنی رۆمەکان دەلێین (ولاتی یان خاکی رۆم) گەرچی ئەوا بۆ چەند سەد سالێکیشە تورك تێدایدا نیشتەجێبوون. سەیر دەکەین دەقە فۆلکلۆرییەکانمان بە دەسەلات و سەردەمی تورکیشیان هەر گوتووە رۆم. ولاتی رۆم و زیندانی رۆمیان و دلڕەقی رۆمیان کە هەمووی مەبەست لە تورکەکانە لە لاوکەکانی کاوێس ئاغا و زۆرانی تریشدا رەنگیان داوەتەوە. شیعری کلاسیکی کوردیش بە هەمان رێچکە، بە ولاتی تورکیان گوتووە رۆم. سالم لە وەلامی قەسیدە بەناوبانگەکەی نالیدا شەش جار ناوی رۆمی هێناوە لە جیاتی تورك کە سلێمانیان داگیرکردبوو. حاجی قادری کۆییش بەشاری ئەستەمبوڵ دەڵێ رۆم و دەفەرمووێ/. لە رۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هایم و حەیران بەرِەنگا تێگەیم کوردە بە شێوەی کوردی کوردستان. بەم جۆرە رۆم بە مەبەستە نزیکەکەی بریتییە لە (تورکیا)ی ئەمڕۆ.

**موسڵ**/ شارێکی گەورەیە لەسەر سنووری باشووری رۆژئاوای کوردستان هەلکەوتوە. لەسەر ناوی موسڵ لێکۆلینەوەی زۆر نەکراوە. کوردی دانیشتوی شارەکە و دەوروبەری پێی دەلێن (میسل). گێزنۆفۆن، کە سەرکردایەتی دەربازکردنی دە هەزار سەربازی بەکرێگیراوی دەکرد لە کوردستانەوە بۆ یۆنان، لە کتێبە زۆر بەناوبانگەکەیدا (ئاناباز)کە سالی (٤٠٠ پ. ز) نووسیوویەتی ناوی شاری موسلی هێناوە و دەنووسێ (هاتینە شاری مویسیلا کە بەردی موسیل بە زۆری لە شورەکەیدا بەکارهاتبوو). بەم جۆرە بۆمان روون دەبێتەوە کە ناوی شاری موسڵ لە بەردی موسیلاوە هاتووە کە شورەی شاری پێ دروست کرابوو.

**کەرێزە بازاڕ یان کەرێجەبازاڕ**/ بازاڕێکی کاتیە، حەوتەی جارێك یان مانگی جارێك یاخود ناو بە ناوو بە پێی پێویست، لە مەیدانێکی تایبەت دەکرێتەوە تا خەلك ئالوگۆڕی بازرگانی بکەن. من لە چەند شوێنێکی کوردستان تێبینی بازاڕی لەمجۆرەم کردووە. لە ناو هۆزی نیوە کۆچەری (هەرکی) یان. هەروەها لە دێی چکۆلەی (کەلێتە) لە بناری شاخی کارۆخ (ڕواندز) هەمان دیاردە پێی دەگوترا (کەرێجە بازاڕ). لە گوندی

گەورە و ناسراوی (وەرتێ) هەموو رۆژانی هەینی، دوای نوێژ لەبەردەم مەیدانی بەردەم مزگەوتی گەورە، بازاڕێکی لەم چەشنەیە دەکرایەوە. لە شارەکانی میاندواو و مهابادو شنۆ و سەردەشت، بازاڕی لەجۆرە زۆر باو بوو، کەچی نەمتوانی بزانم کە ئاخۆ ناوێکی هاوبەشیان بۆ ئەو بازاڕانە هەیە. میاندواو پێیان دەگوت (بازاڕی چوارشەممە) کە بازاڕێکی زۆر گەورە بوو بۆ شارەکانی نەغەدە، مهاباد و میاندواو. پاشگری (بازاڕ) لەو ناوە لێکدراوە، پاشگرێکی زۆر کۆنی کوردیە و لە (باژ + گێر)ە وە هاتووە کە دواتر بوتە باژێڕو بازاڕ و دیارە شوێنی وەرگرتنی (باج) یان (باژ)یش بووە. بەڵام (کەرێزە) بۆ سەدەکانی یەکەم و دووەمی زاینی دەگەڕێتەوە کە ئاینی مەسیحی لە کوردستان شوێن پێی خۆی کردبووە. کەرێز لە وشەی (کەرکیز)ی گرێکییەوە هاتووە کە واتای (یەکشەممە) دەگەیەنێ. لەو کاتانەدا رۆژی یەکشەممە رۆژی چوونە کڵێسا و خواپەرستی بووە. بە دووری نازانم کە هەروەکو لە گوندی وەرتێ بینیمان، ئەو کاتەش لە بەردەم کڵێسادا بازاڕی یەکشەممە (کەرکێس بازاڕ) بەرپاکرابێ. وشەی (کەرکێس) لەناو کلدانییەکان بوتە ناوی کەسی بە شێوەی (قرقس یان قرقوس). لە زمانی کوردیشدا گۆڕانی بەسەرداهاتووە بۆ کەرێزە و کەرێجە.

**مراوی**/ مراوی لەدوو وشەی لێکدراو پێك هاتووە. مر یان مرغ +ئاوی. مر و مرغ واتای پەلەوەرێکی بچووك دەدات. هەردوو وشەکە بەسەریەکەوە بۆتە مرئاوی و دواتریش مراوی.

**مریشك**/ وشەی مریشك لەدوو وشەی لێکدراو پێك هاتووە. مر یان مرغ کە پەلەوەرێکی بچووکە +هیشك یان وشك. وشە لێکدراوەکە بەسەر یەکەوە بۆتە مرغ هیشك ئینجا مر هیشك و مریشك. مەبەست لە مریشك و پەلەوەری وشکێنە.

**مامر**/ لەگەرمیان بە مریشك دەگوترێ مامر. مامر لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە. ما واتای مێینە دەگەیەنێ کە پێچەوانەی نێرەیە + مر یان مرغ کە پەلەوەری بچووکە. هەردوو وشەکە بەسەر یەکەوە بۆتە مامرغ و مامر.

**کەروێشك**/ ناوی گیانەوەری کەروێشك لە دوو وشەی لیکدراوی سادە پێکهاتووە کەر+گوێشك. وشەی لێکدراوی کەر گوێشك، کەرگوێچکە. بە تێپەڕبوونی کات گۆڕاوە بۆ کەروێشك و کێبروشك. ماندو/ وشەی ماندو لە دوو وشەی لێکدراو پێکهاتووە. ماه +ئەندوه. ماه بە واتای تەماوی دێت. ئەندوهیش بریتیە لە هاڵاوی خەم و پەژارە.

وشەکان بەسەریەکەوە هالآوی تەماوی یان خەم و پەژارەی تەماوی دەگەیەنن کە نیشانەی کەسێکی شەکەتە. وشەی لێکدراوی **ماهەندوە** بە تێپەڕبوونی کات بۆتە **ماهەندو** – **ماهەندو** و **ماندو**.

**هەناسە**/ هەناسە لە دوو وشەی لێکدراوی **ئەندوە + سی** پێکهاتووە. واتای وشە لێکدراوەکە دەبێتە هالآوی سییەکان. ئەندوە سی بە تێپەڕبوونی کات بۆتە ئەندوسی، هەنووسی و هەناسی و هەناسە.

# VI
## لێکچوونی زمان

لێکچوونی دوو زمان یان پتر، بابەتێکی زۆر ئاڵۆز و تێکەڵاوە. زۆر هۆی جۆراوجۆر و لێك جیا هەن کەوا دەکەن دوو زمان لە یەکتر بچن. لێکچوونیش لەسەر ئاستی جۆراوجۆر و بە رادەی لێکجیا هەیە یان دەبێت. جاری وا هەیە لێکچوون لەسەر ئاستی رێزمانی، دیار و بەرچاوە. هەندێ جار، دوو یان چەند زمانێك لە یەك سەرچاوەی زمانی مێژوویییەوە وشە وەردەگرن. بۆیە لێکچوونەکان تەنیا لەو وشە وەرگیراوانەدا دەبێت. هەندێك جار لە یەکچوونی دوو زمان لەسەر بناغەیەکی پتەوو بەرفراوان دەبێت، وەك لەیەکچوونی ئەو زمانانەی کە سەر بە خێزانێکن و لە وڵاتانی هاوسێ و هاوسنوور یان سنوور تێکەڵیش بەکاردێن. واتا زمانەکان بە درێژایی مێژوویەکی درێژ کاریان لە یەکتری کردووە. جۆرێکی تری لەیەکچوون، لەو زمانانەوە دەبێت کە جاران زاراوەی جیاجیای زمانێکی دایك بوون. بەهۆی لێك دوورکەوتنەوە و لێکدابڕانی جیۆگرافی، هۆکاری دەرەکی، وەك راگواستن، نیشتەجێبوونی میللەتێکی تر لە نێوانیان، بەهێزبوون یان کزبوونی پەیوەندی فەرهەنگی پارچەکانی وڵاتێك بەیەکترییەوە، زاراوەیەك بۆ ئاستی زمانێکی سەربەخۆ گەشە دەکات. وەك لە زمانەکانی وڵاتانی (سکەندیناڤی، دانیمارکی، سویدی، نەرویجی و ئیسلەندی) دەبینین. هەندێك جار لەیەکچوونی دوو زمان، ئاڵۆز و چەند سەرەیە، هەروەك لە لەیەکچوونی زمانەکانی کوردی و فارسی و دەری و تاجیکیدا دەیبینیت. زمانی کوردی (یان شێوە زارێکی سەدەی هەشتی زاینی زمانی کوردی)، شان بەشانی چەندان زاراوە و زمانی تری نزیك لە کوردی، وەك دەری و خوزی و سەغدی و خوارەزمی و هتد، بە تێکهەڵکێشکردنی وشەگەلی عەرەبی، لە سەرەتاکانی سەدەی هەشتەمی زاینیدا، زمانی فارسییان دروست کردووە، هەربۆیەشە زمانی فارسی جگە لەوەی وشەگەلێکی کۆنی کوردی یان لە کوردی چووی تێدایە، هاوکات زۆر لایەنی رێزمانیشی لە رێزمانی زمانی کوردی دەچێت.

هەندێ جار دەسەڵات و هێژمۆنی دەسەڵاتی نەتەوەیەکی سەردەست، وەك بەرەنجام زمانی ئەو نەتەوەیە بەسەر زمانانی نەتەوەکانی ژێر دەستدا زاڵ دەکات. بەم جۆرە زۆر

وشەی زمانی سەردەست دەکەوێتە ناو زمانی بندەست. لە نموونەی ئەمجۆرە پەیوەندییە دەتوانین سەیری زمانی رووسی و زمانەکانی تری ناو ئیمپراتۆریای جارانی رووسیا بکەین. زمانی ئاین وەکو زمانێکی پیرۆز چاو لێکراوە و هەمیشە کاریگەریی بەسەر زمانی پەیڕەوانی داناوە. کاریگەریی زمانی ئاینی، لە وشەگەلی ئاینییەوە دەست پێدەکات، بەڵام زۆر جار وشەی ئاسایش لە خۆ دەگرێ، زمانی سۆمەری وەکو زمانێکی ئاینی، بۆ سەردەمێکی مێژوویی درێژ، کاریگەری بەسەر زمانی بابلی و زاراوە ئارامییەکان هەبوو. زمانی عەرەبی، بەهەردوو شێوەی دەسەڵات و ئاین کاریگەری قوڵی بەسەر زمانی کوردییەوە جێهێشتووە. شوێنەواری زمانی ئاینی ئیسلام (عەرەبی) بەسەر چەندان زمانی ترەوە دیارە وەك زمانەکانی تورکی ئەلبانی، ئوردو، سۆماڵی و هیتریش.

هاوسێیەتی نێوان دوو زمان و دوو نەتەوە یان نەتەوە و زمانان، بەرەنجامی جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە. تەبایی و پێکەوەژیانی ئاشتیانە، تا رادەی ژن و ژنخوازی و تێکەڵاوبوون و توانەوەی سروشتی. بازرگانی و هاموشۆ سات و سەودا، یاخود شەڕ و پەلامار و راونان و داگیرکاری. ئەو پەیوەندییانە هەرجۆرێك و هەرکامیان بێت، سەرەنجامەکانی لە رووی زمانەوە بەیەك ئاراستەن، ئەویش جێهێشتنی کاریگەریی زمانەکانە بەسەر یەکەوە.

کاریگەریی زمانان، لە سەردەمی نوێدا لە شێوەی هاوسنووری و هاموشۆو پەیوەندییە کلاسیکییەکان تێپەڕیوە. تێرمە زانستیە جیاوازەکان، داهێنانە تەکنۆلۆجییە تازەکان و تیۆرییە رامیاری و کۆمەڵایەتییە هاوچەرخەکان، کە هەموویان یان بە زمانی ئینگلیزی داهێنراون یان بە زمانی ئینگلیزی دارێژراونەتەوە، خەریکن وەك یەك دەچنە ناو هەموو زمانێکی زیندوو و کارامەو چالاکەوە.

زمانی کوردی، وەکو هەر زمانێکی تری دانەبڕاو و چالاکی سەر ئەم گۆیی زەوییە، خاڵی هاوبەش و لایەنی لێکچوونی، لەگەڵ چەندان زمان هەیە. هەندێ لەو لێکچوونانە پەیوەندی بەرانانی دەسەڵات و هاوسێیەتیەوە هەیە. هەندێکی تر لە لێکچوونەکان بۆ هاوبەشی لە سەرچاوە دەگەڕێتەوە. دیارە زمانی فارسی و هاوشێوەکانی (دەری، تاجیکی) لایەنی لێکچوونیان لەگەڵ کوردی یەکجار زۆرە. عەرەبی و تورکیش، بەهۆی ئاین و سەدانساڵی دەسەڵات رانان لە کوردستان، کاریگەری خۆیان بەسەر زمانی کوردییەوە جێهێشتووە. نموونەی لێکچوونی ئەو زمانانە لەگەڵ کوردی هێندە زۆرن کە

دەکرێ بۆ بەراورد کاری هەر زمانێك، چەندان کتێب بنووسرێن. ئێمە بۆ پیشاندانی نموونە سێ زمانی ترمان هەڵبژاردووە. ئەو سێ زمانە هەرسێکیان لەگەڵ کوردی هاوخێزانن، واتا سەر بە هیندۆئەوروپیەکانن. هەریەکەیان شێوازێکی جیاو سەربەخۆی لێکچوونی لەگەڵ کوردیدا هەیە. من لە خەرواری هەریەکێ لەو سێ زمانە مشتێك وشەی لێکچووو لەگەڵ کوردی هەڵدەبژێرم و دەیخەمە بەردەستت. ئەوەی کە گرنگە هێمای بۆ بکەم ئەوەیە کە وشەکانی ئەو سێ لیستەیە کەرەستەی خاون و کاریان لەسەر نەکراوە. بۆیە ئەوەی نیازی کار لەسەرکردنییەتی دەتوانێ سوودیان لێ وەربگرێ بۆ لێکۆڵینەوەی قول و بەپێز.

یەکەمین زمان لەو سێ زمانانەی هەڵم بژاردووە زمانی ئەرمەنییە.

زمانی ئەرمەنی زمانێکی تەنیا و تاك هەڵکەوتوی خێزانی هیندۆئەوروپییە لەو رێگایەوە ئاساییە گەر ژشە گەلێکی کوردی و ئەرمەنی، رەگی هاوبەشیان هەبێت. نابێ ئەوەش لەبیر بکەین کە ئەرمەنستان هاوسێی باکووری کوردستانە. بەرلە هاتنی تورکان بۆ ئاسیای بچووك و گیرسانەوەیان لە خاکی رۆم، ئەوا ئەرمەنستان سەدان ساڵ بوو هاوسێی تاقانەی باکوورمان بوو. تەنانەت لە زۆر شارو شارۆچکەو گوند، کورد و ئەرمەن بەیەکەوە و بە تێکەڵاوی دەژیان.

زمانی دووەم رووسیە. زمانی رووسی سەربە دەستەی سلاڤیی خێزانی زمانە هیندۆئەوروپییەکانە. رووسەکان لە کۆتایی سەدەی حەڤدەیەمەوە بەرەو خوار داکشان و زۆر لە سنووری کوردستان نزیك کەوتنەوە. لە سەدەکانی ۱۸و ۱۹و ۲۰دا دەیان جار لەشکرکێشیان کردۆتە ناو کوردستان. زمانی رووسی بەهەردوو شێوە لەگەڵ کوردی دانووستانیان بووە. خێزانە زمانی هاوبەش و هاوسێیەتی. دوا زمانیش کە بەراوردمان کردووە لەگەڵ کوردی، زمانی سویدیە. سویدی سەر بە دەستەی جێرمانی خێزانە هیندۆئەوروپییەکانە. سوید لەوپەڕی باکووری ئەوریا و دوور لە کوردستان هەڵکەوتووە. لە خزمایەتی و لێکچوونێکی وشە، لە نێوان کوردی و سویدی، رەگی مێژوویی بۆ چەند هەزار ساڵێك دەگەڕێتەوە. بۆ ئەوکاتانەی کە هێشتا میللەتە هیندۆئەوروپییەکان بەیەکەوە و لە شوێنێکی هاوبەش دەژیان و بەیەك زمانی هاوبەشیش دەدوان.

## لیستێکی وشەی لێکچووی ئەرمەنی _ کوردی

هاوینی ساڵی ١٩٩٠، سەردانێکی کەنارەکانی دەریای رەشم کرد لە وڵاتی ئۆکراینا، لەوێوە بە هەڵم زانی و سەردانێکی خێرای وڵاتی گورجستان (جۆرجیا) م کرد. لە جۆرجیا خۆم لە شارۆچکەیەکی ئەرمەنی زمان دیتەوە. لە دوکانێکی بچووك نیازی شت کڕینم هەبوو، کاتێ کە گوێم لە گەنجێکی ئەرمەنی بوو لەبەر خۆی منگەمنگی دەکردو گۆرانی دەچڕی. نەم دەزانی بەچ زمانێك گورانی دەگوت، بەڵام بەسەر سوورماوی گوێم لێ بوو وتی (هەزار ئەفسون). زۆری نەبرد جارێکی تریش (هەزار ئەفسون)ی دووبارە کردەوە. لێی چومە پێشەوە و سڵاوم لێکرد و. دوای ئەوە بە زمانی رووسی لێم پرسی کە ئاخۆ (هەزار ئەفسون) واتای چییە و بەچ زمانێکە؟ حەپەسام کاتێ کە وتی هەزار ئەرمەنییە و واتای (تیسیچە)یە، ئەفسونش هەر ئەرمەنییە و بەواتای (سەژەلێنییە، ژاڵ) بەکار دێت. رێك وەك واتاکەی بە کوردیی وایە! ساڵان رۆیشتن و شەقی رۆژگار هەڵیدامە وڵاتی سوید. لە ساڵی خوێندنی ٢٠٠٣ ـ٢٠٠٤ لە شاری ستۆکهۆڵم، دوو خوشکی ئەرمەنی کەوتنە ئەو پۆلەی کە من وانەم تێدا دەگوتەوە. جار جار دەم دواندن. لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت کە گەلێ شەی هاوبەش، لە نێوان هەردوو زمانی کوردی و ئەرمەنی هەن. جگە لە وشەی لێك چوو، بە دەیان داستانی فۆلکلۆری، ئاواز و دابوونەریتی کۆمەڵایەتی هەن کە کوتومت لە یەکتری دەچن. لەوەش سەرنجڕاکێشتر ئەمەیە کە ئێمە و ئەرمەن، کۆرپەو ساواکانمان لە دەسرازە دەپێچین و لە لانك دەخەوێنین، هەر بۆیەش پشتەسەری هەردوو نەتەوە پانن.

پێش خویندنەوەی لیستەکە، خراپ نییە گەر خوێنەری کورد بزانێ، ئەرمەنییەکان بە وڵاتی خۆیان دەڵێن (هایستان) و بەگەلەکەشیان دەڵێن (هایك).

| ئەرمـــــەنی | کـــــوردی |
|---|---|
| یەز | ئەز، مـن. |
| (م) راناویی لکاوی (م). | ڕاناوی لیکاوی (م) بۆ کەسی یەکەمی تاك. |
| وەك. یەز پارکوم م. | ئەز پاڵدەکەو م. |
| یەز کنومە م. | ئەز دەنوم. |
| دژوار. | دژوار، سەخت. |
| ئامان. | ئامان، قاپو قاچاخ. |
| دروَش | درەفش، ئاڵا. لە سەردەمی ساسانیاندا، |
| | ئاڵای وڵات کە گوایە ئاڵای کاوەی ئاسنگەر |
| | بووە، بە زێرو بەردی بەنرخ دەرازێنرایەوە. لە |
| | ئەنجامدا دەدرەوشایەو، بۆیە بە ئاڵاکە |
| | دەگوترا (درەفش). ناوی درەفشتەنیا لە |
| | زمانی کوردیدا وەکو فرمان بە شێوەی |
| | درەوشانەوە دەدرەوشێتەوە ماوە. |
| خندە | خەندە، پێکەنین. |
| لال | لاڵ. |
| پەنیر | پەنیر. |
| دوڕ | دەرگا، (وشەی دوڕ لە زمانی کوردیدا، |
| | بەواتای ناودوە، بەشی هەرە سەرەوەی ژوور، |
| دوشمان | بنەبان دێت. ) |
| | دوژمن. (دوژمن بە کوردی وشەیەکی |
| قاز | لێکدراوە لە دژ+ مـن، پێکهاتووە بە واتای |
| خاچ | دژی مـن). |
| شارژ | بازدان، یان راکردن. |
| چلیك | خاچ. |
| کۆڤ | شلەژان. |
| کورەك | چێڵ، مانگا، چێلك. |
| | گا. |
| | جاشك (تێبینی وشەی کوڕ بکە وەك |

| | |
|---|---|
| مێغو | بەچكەی نێرینەی مرۆڤ). لام وایە (كورِە)ی |
| كار | عەرەبیش كە جاشكەكەرە، هەر لە كەری |
| جو | كوردییەوە وەرگیراوە. |
| | مێروو. |
| سار | كەڤر، كەستەك، بەردی گەورە. |
| | هێلكە. (سەیری وشەی جوجەڵە یان جەچكە |
| | بكە كە لە هێلكەوە پەیدا دەبێت). |
| | چیا، شاخ، كێو. (سار، وەك ناو بۆ چیا لە |
| كاتو | زمانی كوردیدا لە ناوی هەندێ زنجیرە شاخدا |
| ئانتار | هێشتا بەكار دێت، وەك هەساری رووستێ، |
| | هەساری سەكران). |
| گارِ | كتك، پشیلە، پسیلە، پشك. |
| سپی تاك | دار، درەخت (پاشگری ئەرمەنی تار و داری |
| نارنجی گوین | كوردی سەیر بكە). |
| كاپویت | كاورِ، بەرخ. |
| سیڤ | سپی. |
| | نارنجی. (وشەی گوین بە ئەرمەنی واتا |
| گێتین | رەنگ). |
| | كەویت، چویت، كەوی، شین. |
| | رِەش، (شەڤ یان شەو كە هێمای رەش و |
| | تاریكیە لە سیڤ دەكات. |
| | زدوی، (وشەكە لەگەڵ وشەی گێتی |
| | ئاویستایی ئاشنایەتی هەیە). |

جگە لەمانە دوو پێشگری ناوی زمانی ئەرمەنی، سەرنجی منیان راکێشا، کە چۆن هەمان رۆڵ لە زمانی کوردیدا دەبینن. لە زمانی ئەرمەنی بە باوك دەڵێن (هایریك) بە دایکیش دەڵێن (مایریك). سەرنج لە هەردوو پێشگرەکانی (ها) و (ما) بدە. ها لە هایریك دا سومبولی نێر. هەمان پێشگری ها وەکو سومبولی نێر لێر لە زمانی کوردیدا لە (هەسپ، ئەسپ) و هێستر، بە شێوەیەکی بزر ماوەتەوە. پێشگری (ما)ش لە وشەی (مایریك) کە وەکو سومبولی مێیە لە ئەرمەنی بەکار هاتووە، ئەوا لە کوردیدا بە فراوانی بەرچاو دەکەوێت و بۆ هەمان مەبەستیش وەك: ماین، مەڕ، مانگا، مالۆس، ماکەر، ماکەو، مریشك، مراوی، مامز، مامر و هتد. . .

## لیستی وشەی لێکچوو و رووسی ـ کوردی

بەپێی ئاستی تێگەیشتنم، لەیەکچوونی زمانی رووسی و کوردی، رووبەرێکی فراوانتری، لە تەنیا وشەی لەیەکچوو هەیە. لە رووی رێزمانییەوە، دەتوانم هێما بۆ گۆڕانی ناو و راناو بکەم بەهۆی (راناوی لکاو)ەوە، کە زمانی رووسیدا بەسەر شەش بەشدا دابەشکراوە. هەمان دیاردەی کۆڕینی ناو بەهۆی راناوی لکاوە وە لە زمانی کوردیش هەیە. دیارە روبەری جیاوازیش زۆر گەورەیە. زمانە سلاڤیەکان، لەوانە رووسی، بەدەست نێرو مێ ناڵەیان دێ و فرمان بەگوێرەی رەگەزی بکەر دەگۆڕێ.

وشەی لێکچووی رووسی وکوردی پانتاییەکی گەورە داگیر دەکات، کە ئەمە کاری ئێمە نییە. مەبەستی ئێمە دەرخستنی لیستێکی بەراوردکاریە. ئەو وشە لێکچووانەی بەردەستت، لە زستانی ١٩٨٩-١٩٩٠ کە لە رووسیا بووم، تۆمارم کردوون. خۆم لەو وشانە پاراستوە کە لە زمانە رۆژهەڵاتیەکانی وەك عەرەب، فارسی و تورکیەوە، کەوتونەتە ناو هەردوو زمانی رووسی و کوردییەوە.

| رووســــــی | کـــــوردی |
| --- | --- |
| بیّز | بیّ، بەبیّ. |
| برات | برا. |
| بەران | بەران. |
| پلۆڤ | پلاو. |
| پۆستۆی | پوچ. |
| پیادسۆد | پیّنج سەد. |
| ستۆ | سەد. |
| چابان | شوان. |
| چای | چا. |
| چتیری | چوار. |
| زنات | زانین. |
| زیملیا | زەمین. |
| ژیّنە | ژن. |
| ژیزن | ژین. |
| سەباکە | سە، سەگ. |
| سینی | شین. |
| سەماوەر | سەماوەر. |
| سوپاسیبا | سوپاس. |
| شەگال | چەقەڵ. |
| کورتکە | کورتەك. (کورتەك لە کوردیدا، کورتانیشی لیّ دروستکراوە). |
| کەکۆم | کامە. |
| کۆژ | کاژ. (پیّست). کاژ بە کوردی پیّستی داماڵدراوی مارە. |
| نۆڤەی | نویّ. |
| نیزنایۆ | نازانم. |
| زنایۆ | دەزانم. |
| سترانە | ولاّت. سەیری (ستان)ی کوردی بکە کە لە پاشگری چەند ولاّتیّکدا |

| | |
|---|---|
| مەلیۆتکە | هاتووە بە واتای ولاّتی ئەو نەتەوانە وەك كوردستان. مەلۆتکە. (منداڵی ناو قۆنداغە، ساوا) |
| پیزدا | لە زمانی رووسیدا کۆئەندامی مێینەیە. لە بەرامبەردا زمانی کوردی (پزدان)ی هەیە کە بە تورەگەیەك دەڵێن، کۆرپەلەی گیانەوەری لە ناوە، کاتێ کە لە دایك دەبێت. |
| دومان | تەم و تومان. |
| پە | بە، لە هەندێ شوێنی بەرانەتی دەگوترێ پە. |

## لیستی وشەی لیکچووی سویدی ـ کوردی

بەهۆی نەبوونی تێکەڵاویێکی راستەوخۆ لە نێوان کوردی و سویدیدا، ئەوا دۆزینەوەی وشەی دەقاودەق و کوتو مت وەك یەك لە هەردوو زمانەکە، کارێکی چاوەڕوانکراو نییە. جگە لەو وشانە نەبێت کە هەردوو زمان لەیەك سەرچاوەی هاوبەش وەریانگرتووە وەك وشە زانستی و تەکنیکیەکان و هەندێ وشەی ئاینی. هەر بۆیەش دەبێ بە شێوەیەکی قوڵتر سەیری وشەی لێکچووی نێوان هەردوو زمان بکەین. وەك ئەوەی کەدوو وشە لە یەك دەچن بە کەمێ گۆڕان لە گۆکردندا. یان دوو وشە زۆر لەیەك دەچن، بەلاّم بۆ دوو واتای لە یەك نزیك، نەك وەك یەك بەکاردێن. جاری واش هەیە کە وشەیەك بە چەند قۆناغێکی گۆڕانکاری فۆنەتیکی دا تێپەڕیوەو ناسینەوەی گۆکردنی بنەڕەتی و مەبەستی بەکار هێنانی زۆر رون و دیارنییە. بەلاّم بە لێکۆڵینەوە، دەکرێ هێما بۆ بنەڕەتی وشەکان بکرێت.

| سویـــد ی | کـــــوردی |
|---|---|
| ئەسپ Asp | ئەسپیندار، چنار. |
| ئێگ ´Ägg | هێك، هێلکە. |
| برور bror | برۆ. |
| بارك Bärk | بەرگ (بارك لە سویدی بە توێکڵی قەدی دار دەگوترێ، کە بەرگی دارە) سەیر دەکەین لە کوردیدا (بەرگ) بۆ مرۆڤ بەکار دێت. |
| بێر bär | لەبەر دەکات. |

| | |
|---|---|
| بێرە bara | بارهەلگرتن |
| پارە pära | پەرین. جوتبوونی نێوان دوو رەگەزی نێر و مێ. |
| پراتە prata | قسەکردن. سەرنج بدە وشەی (پرتە) لە زمانی کوردیدا کە مەبەست بۆڵەبۆڵ و نارەزایی دەربڕینە بەژێر لێوەوە. |
| تالە tala | دەدوێ. سەرنج بدە وشەی (دەلێ) کە شێوەیەکی تری دەدوێیە. |
| تیتە titta | تەماشاکە. سەرنج بدە وشەی(دیتی) کە تەماشاکردن دەگەیەنێ. |
| دۆتەر dötter | کچ. یان (دۆت) کە لە زۆر شوێنی کوردستان بەکار دێت. |
| دیمە dimma | تەم. |
| دو du | تو، تۆ. |
| دال dal | دۆڵ. |
| دۆڕ dörr | دەرگا. |
| درۆپ dropp | درۆپە، دڵۆپە. |
| رێڤ räv | رێڤی، رێوی. |
| رێگنە regna | باران، سەرنج بدە وشەی (رێژنە)ی کوردی کە بارانی بە خوڕ دەگەیەنێ. |
| سێر ser | سەیرکردن. |
| سڤاگ svag | سڤك، سوك. |
| شور tjur | شور، نێرەی بزنە کێوی. |
| شێرنە sjarna | ئەستێرە، ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بە سویدی (ستێرنە) بووە و لە پرۆسەیەکی رێزمانی داگۆکردنی گۆڕاوە بەڵام هەر بە(ستێرنە) دەنووسرێت. |
| فۆلك folk | خەڵك. |
| ڤارم varm | گەرم. |

| | |
|---|---|
| ڤاری varg | گوری، گورگ. |
| ڤیسکه viska | فسکه فسك |
| کات kat | کتك، پشیله. |
| کورت Kort | کورت. |
| کڤیننه kvinna | ژن، سەرنج له وشەی (کابان)ی کوردی بدە. |
| گاته gata | جادده، شەقام، (جادده له بنەڕەتدا کوردی نییه). |
| گالن galen | شێت، سەرنج له وشەی (گێل)ی کوردی بده که جۆرێکەله شێتی. |
| گریپەر gripe | گرتن، دەگرێ |
| گرۆته gråtta | گریه. |
| لێپ läpp | لیڤ، لێو. |
| مین min | من، هی من. |
| موس mus | مشك. |
| لوند lund | کەندو لەند. |
| هێر här | لێره. |
| ترۆنگ trång | تەنگ. |
| ئورمار ormar | ماران، چەند مارێك. |
| میره myra | مێرو، مێرووله. |
| مۆردە mörda | کوشتین (فرمان) سەرنج له وشەی (مرد، مرداندن)ی کوردی بدە. |
| مورد Mord | کوشتن، سەرنج له وشەی (مرد)ی کوردی بدە. |
| ها Ha | هەبوون. |
| هۆر hår | پۆر، پرچ، قژ، وشەی پرچ له بنەڕتدا بریتی بووه له (پۆر + چ) بەکرمانجی پرچ ئێستاش هەر پۆری پێدەگوترێ. |
| هێستەر hästar | ئەسپان، (چەند ئەسپێك)، سەرنج بده وشەی (هێستر)ی کوردی. |
| یورد jord | هەرد، ئەرد، عەرد. |
| تینه tina | تواندنەوه، گەرمکردن، سەرنج بده له وشەی (تین)ی کوردی که بۆ تینی رۆژ و گەرمی بەکار دێت. هەروەها بۆ شنگ و هێز و وزه و |

| | |
|---|---|
| | توانای مرۆڤیش بەکار دێت. بەهێزیش دەگەیەنێ. |
| ناڤ nav | ناڤك، ناوك. |
| تاند Tand | دان، ددان. |
| رۆت rött | رەگ، رێ. |
| رێسپێکت Respect | رێز. |
| ئیر yr | وورِ. |
| ستۆنگ stång | ستون، ئەستون، ئەستووندە. |
| نی ny | نوێ. |
| باند band | بەندی کرد. |
| بیندە binda | بەندی کردن. |
| شەکال schakal | چەقەڵ |
| خێل skel | خێل (چاوی خێل) لە بنەڕەتدا وشەی (خێل)ی سویدی بە (سکێل) خوێندراوەتەوە و دەنووسرێ.<br>تێبینی وشەی (سکێل)ی سویدی و (سکێل)ی کوردی بکە کە رەشێنەی چاوە. |
| ئاگا Aga | ئاگادارکردنەوەی منداڵ، تەمێ کردنی منداڵ |
| ستور stor | گەورە، ئەستور. |
| پۆ på | بە. |
| تیل till | تا. |
| مۆنێ måne | مانگ. |
| گرینە grina | گرین، گریان. |

| | |
|---|---|
| گرینیگ grinig | مۆن و توڕە، گرینۆك |
| گاپ gap | دەمی داچەقاو، سەیری وشەی( قاپ) ی کوردی بکە |
| سوت sot | سوتو، تەنی، هیس. |
| سپار spar | هەلگرتن و پاشەکەوتکردن، سپاردن. |
| تون tunn | تەنك. |
| لا ت | بە سویدی بە کەسێکی بێکارەو تەوەزەل دەگوترێ. لە کوردیدا بە کەسێکی بێپارەو بێکار دەگوترێ. |
| ئەنداس Endas | هەناسە |

## V
## له هه‌گبه‌ی پێشمه‌رگایه‌تیمدا

پێش ئه‌وه‌ی بچمه ریزی پێشمه‌رگایه‌تی، به ده‌گمه‌ن چاپکراوێکی کوردی هه‌بوو، که نه‌م خوێندبێته‌وه، ته‌نانه‌ت که ئه‌وانه‌ش به‌زاراوه‌ی تری کوردی چاپ و بلاوکرابوونه‌وه. که چاپه‌مه‌نی کوردی تینوێتی نه‌ده‌شکاند، رووم له عه‌ره‌بیه‌کان ده‌کرد. له دوای سالی ۱۹۷۹، که‌وتمه خوێندنه‌وه‌ی فارسیش، زۆر حه‌زم له زمان بوو. واشم ده‌زانی که له زمانی کوردی شاره‌زاییه‌کی زۆر باشم هه‌یه و له زۆربه‌ی هه‌ره زۆری وشه‌کانی ده‌گه‌م. که‌چی له لادێ کانگاکانی زمانی کوردیم دۆزییه‌وه. که گوێم له خه‌لك گرت و که‌وتمه دواندنیان. ئینجا بۆم ده‌رکه‌وت، چ سامانێکی زمانه‌وانی هێشتا ده‌ست لێنه‌دراو، له سینگی ئه‌و خه‌لکه په‌نگی خواردوه. هه‌ر زوو که‌وتمه وێزه‌ی کۆکردنه‌وه‌ی ئه‌وانه‌ی ده‌ستم پێیان راده‌گه‌یشت. زۆر جا که وشه‌یه‌کی تازه و ده‌گمه‌نم گوێ لێ ده‌بوو، ناچار ده‌بووم به دوایدا بچم و لێی بکۆلمه‌وه تا ده‌گه‌مه بنج و بنه‌وانی ئه‌و که‌سه‌ی وشه‌که‌ی له ده‌م ده‌رده‌هات، زۆر جار لادێییه‌کی نه‌خوێنده‌وار بوو. زۆر به ئاسانی شپرزه ده‌بوو و به هه‌له له لێپرسینه‌وه‌کانم تێده‌گه‌یشت. له‌و چه‌ند ساله‌ی که خه‌ریکی ئه‌م کاره‌بووم، رووداوی زۆر خۆش و سه‌رنجراکێشم پێش هاتووه که رۆژێك دێت و له شوێنی خۆی ده‌یانگێڕمه‌وه. به‌شێکی زۆری هاورێ پێشمه‌رگه‌کانیشم هه‌ر لادێیی بوون و خاوه‌نی زمانێکی پاراو و ده‌وله‌مه‌ند بوون. که ده‌یاندی من خه‌ریکی گه‌ران و پشکنینی هه‌ر وشه‌یه‌کم که له زاران ده‌رده‌چێ، خوا هه‌لناگرێ هه‌ندێك له‌وان زۆر یارمه‌تیان ده‌دام، چه‌ندانێك له‌و پێشمه‌رگانه دواتر له نه‌به‌ردیه‌کاندا شه‌هید بوون، به‌لام ئه‌و وشانه‌ی به‌رده‌ستتان، رۆحی نه‌سره‌وتی ئه‌وانن و بۆ هه‌میشه به زیندوی ده‌مێنه‌وه. له پال ده‌فته‌ره‌کانی وشه، چه‌ندان ده‌فته‌ری تریشم ره‌شکردنه‌وه. بیره‌وه‌ری رۆژانه‌م. گفتوگۆ له‌گه‌ل خه‌لکی پیرو دنیادیته، له‌وانه دوو چه‌کداری (ئۆزده‌میر). ژماره‌یه‌کی زۆری په‌ندی پێشینان. رووداوی گرنگی ناوچه‌یی. هه‌ندێ داب و نه‌ریتی کوردی، که ته‌نیا له شوێنی به‌ر ته‌سك و دابڕاو پیڕه‌ویان لێده‌کرا. ناوی گژوگیاو شتی تریش. هه‌میشه ده‌مزانی که شوێن و سه‌رده‌می کارم، سه‌خت و نه‌گونجاوه. بۆیه پێشبینی هه‌موو رووداوێکم ده‌کرد. جارێك ی له سالی ۱۹۸۳ له دۆلی خانه‌قا، هه‌موو کتێبه‌کانم له مالێك له‌ناوچوون.

جاری دووەم، ویستم دەفتەرەکانم باشتر بپارێزم. ئەوە بوو رۆژی ٢٨/ ٣/ ١٩٨٧ لەگەڵ هێزێکی گەورەی مەڵبەندی هەولێر بۆ شەڕی قەیوان ـ ماوەت بەڕێ کەوتین. دەمزانی شەڕەکە سەختە و لەوانەیە بەزیندوی نەگەڕێمەوە، هەر بۆیەش هەموو دەفتەرەکانم لە گوندی (بێڕۆ)ی دۆڵی بالیسان بەجێ هێشت. ئەوەبوو دوژمن رۆژی ١٧/ ٤/ ١٩٨٧ بەچەکی کیمیاوی لە دۆڵەکەی داو هەموو گوندەکانیشی سوتاند. زیانێکی گیانی زۆر گەورە بەر خەڵك کەوت. دەفتەرەکانی منیش هەموویان تێدا چوون. کاتی خۆی، لەگەڵ هاوڕێی جوانە مەرگم (یوسف شەریف) زۆر بەیەکەوە بووین. ئەویش لەسەر زمان کاری دەکرد. کاری ئەو دۆزینەوەی رێسایەك بوو بۆ دروستکردنی وشە لە وشە، زۆر جار دەفتەرەکانی منی وەردەگرت و هەندێ وشەی بۆ خۆی گوڵبژێر دەکرد.

کاکە یوسف لە کاتی کیمیا بارانەکە، لە (دۆڵە کۆگە)ی بناری قەندیل بوو. نامەیەکم بۆی نارد و داوای وشە گوڵبژێرکراوەکانی خۆمم لێ کردەوە. زۆری نەبرد، هەرچی لابوو بۆمی ناردنەوە، خۆشم هەندێکیانم لە بیر مابوو. دوای ئەوەش تێهەڵچومەوە، بەڵام لە دۆخێکی یەکجار سەختدا. دێ نەمابوو، ئێمەی پێشمەرگە وەك ماسی بێ ئاو کەوتبووینە چۆڵی. ئەو زەمینە لە بارەی جاران لە دەست چووبوو. تەنیا ورە بەرزی و کۆڵنەدان بوو وایکرد نەمانەی بەردەستت لەناو نەچن و دەربچن.

فرمان، سەختترین و خۆگرترینی بەشی زمانە، زمان زۆر بەسەختی دەتوانێ، فرمانی تازە دروست بکات، بە پێچەوانەی ناو و سیفات، کە هەم بە ئاسانی دادەهێنرێن و هەم بە ئاسانیش لە زمانانی ترەوە وەردەگیرێن، لەبەر بەهای گرنگی هەر فەرمانێك، لێرەدا من هەموو فرمانەکانم تۆختر نووسیوە، بۆ ئەوەی بە ئاسانی جیابکرێنەوە، دیارە هەندێ لەو وشانە بە پاشگری (بوو، کرد) شێوەی فەرمانیان دەردەکەوێت.

دەزانم هەندێ لەو وشانە لە نووسین و فەرهەنگە کوردییەکاندا چاپکراون و بەکار هاتوون. هەندێکی تریشیان بە واتایەکی تری جیا لەو واتایەی من گوێم لێبووە و تۆمارم کردووە، تۆمار کراون، بەڵام من دژی شەپۆل مەلەم دەکرد و هەر ئەمەم بۆ دەرباز کرا. ئەگەر چەند وشەیەکی کەمیش لە فەرهەنگی زمانە شیرینەکەم، جێی خۆی بگرێت، ئەوا شانازی پێوە دەکەم و رەنجم بەفیڕۆ نەچووە.

وامن هەگبەکەی خۆم هەڵدەڕێژم. ئێوەش فەرموون.

شاسوار

| وشـــه | شوێنی بەکار هێنانی | واتـــــــــا |
|---|---|---|
| ئـ | | |
| ئاگا | هەولێر/ بەرانەتی | روخسار. شێوەی دەموچاو |
| ئاخورکە | مێرگە سوور | جۆرە پێشکە یان مێشولەیەکی زۆر بچووکە دەچێتە ناو موی سەر یان دەپەڕێتە ناو چاو و ئازاری هەیە. |
| ئاوگە | بەرانەتی/ هەولێر | لاوەکی. ئەو مەڕەی لە رانی خۆی دادەبڕێ و دەچێتە ناو رانێکی تر یان ون دەبێ. |
| ئارِسان | دەشتی هەولێر | رق لێ گرتن. پەلامار بردنە سەر یەکێك. |
| ئاژال | باڵەکایەت | کارتەی تازەی ساڵ. خەلفە. لقی ئەمساڵی دار. |
| ئاڵشت | هەورامان | شت فرۆشتن بەگۆڕینەوە. |
| ئالڤاندن | وەرتێ | توشکردن، تێوەگلاندن. |
| ئاڵیندار | باڵەکایەتی | شەقڵە. وەڵەکە (ئاڵودار)یش دەگوترێ. |
| ئەندابەندا | وەرتێ | ئاستی. هەرستی. لە راستی. نموونە: ئاوەکە ئەندابەندای بەژنێ من بلند بووە. |
| ئاراوکردن | | کاتێك کە جلکێك لە کەفاوی جلکێکی تری شوراو وەردەدرێ بۆ ئامادەکردنی بۆ شوشتن. |
| ئامێژەن | بەرانەتی | هەوێنی پەنیر. |
| ئاورنگ | بەرانەتی | شەونم. پرِوشکی ئاگر |
| ئامبازبون | بەرانەتی | سواری کۆڵ بوون. بەلاماربردنە سەر. |
| ئاوزەنگ | بەرانەتی | رکێف |
| ئاوەرست | وەرتێ | ئاودرێکی باریك کە ئاوی پێدا دەروا. |
| ئاياخ | کۆیە | خاپەروك. کۆزەرە. بەشی خراپی شتێك. |
| ئایەخ کردن | بەرانەتی | جیاکردنەوەی چاك و خراپی شتێك. |
| ئایزە وبایزە | دەشتی هەولێر | بە دووکەس دەگوترێ کە هەمیشە پێکەوەبن |
| ئەزرۆك/ زۆر | گەلاڵە | چیلکە داری (گەڵ، دێ)کە گەلاکانی خوراوە. |
| ئەستێو | پشدەر | بێلۆکەیەکی بچووکە. بۆخۆشکردنی ئاگری سۆپای |

| | | |
|---|---|---|
| | | داربەکار دێت |
| ئەستێرك | هەولێر | هەرزاڵ. پێرك. |
| ئەسكورد | هەولێر | پیل. دەفەی شان . |
| ئەستێوڵك | مەنگوڕایەتی | بێلێکی بچووکی ئاسنە. بۆکڕاندنی کەوڵی نان و شتی تریش بەکار دێت. |
| ئەنجامە | کەرکوك | شریتێکی، قایش، لاستیك یان ئاسنە، کە دەرگای سندوق بە سندوقەکەوە دەبەستیێ. |
| ئەنگۆرە | کەرکوك | رەنگاڵە، کەندەسە ( جۆرە چۆڵەکەیەکە). |
| ئیرۆ | مەنگوڕایەتی | کەسێك بابی خۆی هەبێ پێی بژی، خودکەفا . |
| ئاوزێنە | هەولێر | ئەو ئاسنە نوکدارەی دوو سەری قایشی پێ دەبەسترێ، یان دوو سەری پێڵاوی پێ قایم دەکرا. |
| ئەستێور | هەولێر | ئەو مانگایە ی نازێت یان ئاوس نابێت. |
| ئەغلە ویك | ناو هەرکیان | تاوە. مەقلێ. |
| ئۆین | هەولێر | ئۆین یان ئاین و ئۆین، فروفێڵ، نازکردن. |
| ئۆینباز | هەولێر | فێڵباز |
| ئیسك | بادینان | نزگرە. نەزگرە. بەرسینچکە |
| ب | | |
| با | بۆتان | ئەسڵ. رەسەن. تەبار. لە هەولێردەڵێن (بن) وەك فلان کەس بندیانە یان بنجوە. |
| باخۆش | هەولێر | هەراش. مێرد منداڵ. هەرزەکار. |
| بار تەقا | هەولێر | ئەوەندەی. هەندەی. بەقەد . بەئەندازەی. |
| باریغ کردن | گەرموان/ رواندز | بێبەری کردنی کوڕ لە میرات لە لایەن باوکەوە. |
| بارێزە | وەرتێ | ئەو نزمایییە کە با بەفری تێ دەکات. بەفری |

| | | |
|---|---|---|
| | | شوێنی وا نەرمە و مرۆڤی تێدەچەقیٚ. |
| بارِن | وەرتیٚ | باگر. خانویەکی بە نایلۆن دروستکراوە بۆ چاندنی شەتڵی توتن دروست دەکرێت. |
| باز | مەنگوڕایەتی | رەوت. ئاراستەی جوڵەی ئاوە. نموونە: بازی ئەو چۆمەی بۆکام لایە؟ |
| باکوت | وەرتیٚ | بانگڵۆز بوونەوە. گلۆر بوونەوە. |
| باڵەبان | | باڵندەیەکە لە خەرتەل بچووکترە و زۆر بەرز دەفرِیٚ. |
| بانگەشە | | تەبلیغ کردنی کەسیٚ. پروپاگەندە کردن. |
| بانو | ناوچەی باڵەیی | ئاقار. دەوروبەری گوند یان شار. |
| باوێش | هەودیان/ رەواندز | قەدپاڵی شاخێك کە رێگای پیادەی پێدا تێپەرِیٚ. |
| باوەگۆ | دەشتی هەولێر | رووداوە کەسێك. وەڵامدانەوەی کەسێك و دواندنی. |
| بحالەکی | قامیشلۆ | ژنی سکپڕ. ئاوس. |
| برێنە | | رووبەرێکی بچووکی زەوی لەناو کێڵگەیەکدا کە هیچی لیٚ نارووی جا یان کەند و کۆسپە یان قوچەکەو بەردی سەرزەویەکەی تێدا کۆکراوەتەوە. |
| برِك | باڵەك | شەقڵ |
| برِشت | رانییە | وردە پارچەی قوماش بەرماوەلای بەرگدروو. |
| بزرِکان | بەرِانەتی | تێك چوون بۆ(شیر). رەنگ زەرد هەڵگەران. |
| بزگورِ | بەرِانەتی | جلوبەرگی تێکەڵوپێکەڵ. |
| بژوێن | مەنگوڕایەتی | جێگای بەلەوەرو پرِ لە گیاو سەوزە. |
| بژ | هەولێر | یاڵی ئەسپ. موی پشت ملی ئەسپ. |
| بلەوەز | باڵەکایەتی | دانەکاساو. عەجول. کەسێك خۆی لە هەموو کار بدات. |
| بمدیٚ | رواندوز | (بمدیٚ) بۆ شتێکە کە بۆ خۆت داوای دەکەیت. |
| بناوان | پلنگان/ رانییە | ئەو ژنەی بەرپرسی گاری ناوماڵە. جیٚ پرسی هەموانە. هەروەها بە سەرچاوەی جۆگە و کانیاویش دەگوتریٚ. |
| بنبەست | هەولێر | کۆڵانێکە کە سەرێکی گیراو. وەك لە قەڵا و گەرەکی |

| | | |
|---|---|---|
| | | جوولەکان لە هەولێر. |
| بنبەردوکە | دەرگەڵە/ رواندز | رێواسێکە لە بن تاتە بەرد رواوە و سپی و ناسکە. |
| بنپەلکردن | دۆڵی جافاتی | قونار. هەڵپەرداوتنی داری مێو. لێکردنەوەی گەڵاّ و لقی داری زێدەی دار مێوی ناو رەز. |
| بنکیفرە | دەرگەڵە | یان بنکێرفرە. قون فرە. بە کەسێکی ترسنۆك دەڵێن. |
| بنەسا | بەرانەتی | یان بنێس. بە کەسێك دەگوترێ کە لەرولاواز بوبێت، لەوانەیە بۆ anorexi دەست بدات. |
| بوارەکانی | | کانی زنە. کانی دروزنە. ئەو کانیاوەی کە هاوینان وشك دەبێت. |
| بۆتك | بەرانەتی | ئەو بەشەی درەخت، یان هەرشتێکی تر کە لە ژێر زەوییە وە دیار نییە. ریشە. کۆتەڵەی درەخت. |
| بۆرژان | بەرانەتی/ هەولێر | وەنەوز بردنەوە. خەوە کوتکە. |
| بەتلاّن | نسێبین | پەك کەوتن. هیلاك بوون. ماندووبوون. لە کارکەوتن. |
| بەخۆوەژی | ناوچەی رەواندز | کەسێکە کە خۆی زۆر خۆشدەوێ. نەرگسی. |
| بەرانپیخ بوون | دەشتی هەولێر | شەڕ لەگەڵ کردن و زۆرانێ کردن. بەرەنگاربوونەوە. |
| بەرزەپێ | | گورج هەڵسان. یەك پێ هەڵسانەوە. |
| بەرژی | دۆڵی خانەقا | گیانەوەرێك یان کەسێکی بەزاوزێ، کە زۆر وەچەی لێبکەوێتەوە. |
| بەرژێلە | دۆڵەرەقە | هەنوانی چیا. ئەشکەوتۆکە. شوێنێك باران نایگرێتەوە لە شاخ. |
| بەرەوانی کردن | بەرانەتی | ناوبژی کردن. لێککردنەوەی لایەنی بەشەڕهاتوو. |
| بەرەم | باڵەکایەتی | ژووری ئازوخە لێدانان. |
| بەرەشکاڵ | دۆڵی شاور | گۆڕایی. گۆڕەپان. مەیدان. |
| بەترە ئاو | دۆڵی خانەقا | نیودانە رۆژ ئاودان. نیو دانە رۆژ نۆرە ئاودانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | کشتوکاڵ. |
| بەرکۆز | گەلاڵە/ باڵەکایەتی | گۆیشکە. بەرکۆد. پۆخ. هێشتا نەتەقیووی گەلاّ و گوڵ. |
| بەرگایی کردن | گەلاڵە/ باڵەکایەتی | پاککردنەوەی زەوی بۆچاندن. تەڕاش برینەوە و بەرد هەڵگرتنەوە. پێش گاجوتی تازە کەوتن، بۆ ئەوەی فێربێت چۆن جوت بکات. |
| بەڕاگیر | وەرتیّ | بەو میوەیە دەڵێن کە بەکەڵکی وشککردنەوەو هەڵگرتن دێت. دەشیّ بۆ (تعلیب، معلب) بەکار بێت. |
| بەرهەڵ | باڵەکایەتی | بەهەیوانێك دەڵێن، کە سێ لای دیوار بێت. |
| بەزگ دان | بەرانەتی/ دەشتی هەولێر | سۆزگ بوون. مردن بەداخێکی گەورە و، کۆست کەوتن. |
| بەژك | ناو دەشت | پارچە سەوزاییەك لە شوێنێکی بێ ئاو. |
| بەسەرگرتنەوە | | دۆزینەوەی گیانەوەری ماڵی ونبوو. |
| بەلوکە | خانەقین | میتك. |
| بەڵلی | ئامەد | دیار. نیشانەی ناسراو. بەرچاو (علاقات فارغە). |
| بەڵی بوون | | لێك بوونەوە. |
| بەساتی | بەری رووستیّ | بەپەلە. بەتالوکە. دەڵێن (بەساتیمە دەرۆم). |
| هەرەت | بەرانەتی | شنگ، وزە، هێز، شتێك لەو پەری پێگەیشتن دابێ. |
| بەلەسە | سلێمانی | ئاژەڵی غەزریو، ئاژەڵی مانگرتوو. |
| بیراز کردن | هەلێر | هەڵچنینی ناوەوەی بیر و کارێز بەبەرد یان خشت. |
| بێران | بێرۆ/ دۆڵی بالیسان | لە خوێندن چوونەوەی کەوی راوکەر، کەوی بێراو نرخی دادەبەزیّ و سەری دەبڕن. |
| بیستەك | بەرانەتی | تاوێك، ماوەیەکی کەم. |
| بینا شکێن | | چاوشکێن، کەسێك بترسێنی |
| بیّ فەیز | باڵەکایەتی | کەسێکی رەزا گران، کەسێك کە هەمیشە باری لەسەر شانی کە سانی تر کران بێت، کە سێکی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ناحەز. |
| بەرادان دان | هەولێر | بەکردن دان. نموونە: قاتێکم لای بەرگدرو بەرادان داوە سەری مانگ تەواو دەبێت. |
| بوغز | هەولێر | رق، کینە |

| پ | | |
|---|---|---|
| پارسێك | نسێبین/ قامشلو | یان پارسەك. دەرۆزەکەر. سوالکەر. |
| پاساودان | | دۆزینەوەی بیانو بۆکارێك یان بڕیارێك |
| پاشخوان | | بەرماوە. خواردنی ماوە |
| پاشـقۆڵگرتن | | بە نهێنی و لەپشترا زەبر وەشاندن. |
| پاشەبەرە | هەولێر | دوامنداڵی خێزانێك. پێچەوانەی نۆبەرە. |
| پاشەوانە | دۆڵی جافەتی | پۆسکە. کونی دواوەی کۆڵەس. کە بە چیلکەو قوڕ دەگیرێت. |
| پالاخ | وەرتێ | گۆلك یان گوێرەکەی گامێش . |
| پالگین | بناری قەندیل | ئاوبەر. جۆگەلەیەکە لەدەوران دەوری ڕەشماڵ دەکرێت بۆ پێداڕۆیشتنی ئاوی باران، هەروەها بەواتای (چەلەنگ)یش دێت. |
| پالێن | بناری قەندیل | لەوەڕاندنی مەڕ و بزن بۆ ماوەیەکی کەم، پێش دۆشینیان. |
| پڕژەڵە | وەرتێ | ئەو لقەدارانەن کە بۆ سەر ڕێگای هاتوچۆ درێژ بوونەتەوە. |
| پرێسك | | بوخچەیەکە، گەشتکەر جلوبەرگی چوونە گەشتی لەناو دادەنێ. |
| پزی کردن | گەلاڵە | کاتێ کە با بەفرێکی زۆر لە شوێنێك کۆدەکاتەوە. |
| پسدوك | | باپشکێو. زیپکەیەکی وردە لەلێو یان پێڵو دێت. |
| پشتبەست | وەرتێ | هەزارە. دارێکە شوانە دەدرێتە پشت دەرگا تا باشتر قایم بێت. |
| پنلڕ | بەڕانەتی | نەرم بوون وخاوبوونەوەی زەوی لە بەهاران. |
| پوشی | باڵەکایەتی | کرۆکی ناو داربەڕو. کە بۆ ئاگر کردنەوە بە(بەردەستێ)بەکاردەهێندرێت |

| | | |
|---|---|---|
| پۆخ | دۆڵی بالیسان | گۆپکەی هێشتا نەتەقیوی درەخت. |
| پۆسکە | بێرۆ/ بالیسان | کونی دواوەی کۆڵەس، کە بە چیلکە و قوڕ دەگیرێت. |
| پۆخین | | گەنمی برژاو. |
| پۆیلە | هەولێر | ماشەڵڵا، مۆرویەکە لە نێوچاوانی منداڵی بەر مەمکان قایم دەکرێت، بۆ لە چاوزار پاراستنی. |
| پۆریلە | سلێمانی | ئەو دیارییەیە کە بۆ ژنی تازە منداڵبوو دەبردرێت. |
| پیرە بۆك | سەری کانی | پیرەژنێکی ناحەز کە حەز بە ئاژاوە و تێکدانی نێوان خەڵك بکات. |
| پێخوست | بەرانەتی | شوێن پێ، جێ پێ، شتێك خرابێتە بەرپێیان. |
| پێخوێ | موکریان/ مهاباد | چەپڵە. |
| پێلە کردن | وەرتێ | کە سێك کە مۆرە دەکات و چاوی خۆی زەق دەکاتەوە. |
| پلار | بەرانەتی | توانج. (تعلیق). نمونە: ئەوە بۆچی پلارانم تێدەگرێ؟ لات وایە تێناگەم |
| پێشۆك | بەرانەتی | ئەو بۆشاییەی کە دەکەوێتە نێوان برۆ و بسك، لوت و گوێ لە دەموچاوی مرۆڤـ ئەو شوێنەی (گوللەی بەزەیی) پێوە دەنرێت. |
| پێلەزە | وەرتێ | کنە کردن. |
| پێلێهەڵبڕین | | سنووری خۆبەزاندن (تمادی) |
| پەردێش کردن | وەرتێ | بڕینی لق و پۆپی زێدەی دار لە بەهاران. تا دارەکە بەهێزبێ. |
| پێودڕ | مەنگوڕایەتی | ئەو سەگەی تەنیا بە خەڵك دەودڕێ و پەلامار نابات. |
| پەزێرە | هەڵەبجە | زۆر کۆن. سواو. چێشتی ئێوارە کە بۆ ڕۆژی دوایی هەڵدەگیرێ. |
| پەپۆك | بۆتان/ قامیشلی | کەسێکی بێ دەسەڵات و هیچ لە دەست نەهاتوو. فۆلکلۆر: هەی لێ ڕەوشێ ڕەوشەنێ، پەپۆکێ ل تە ڕەبەنێ. |
| پەسار | | هەوراز |
| پەشتنەوە | رووستێ | هەڵکردنەوەی دوو داو یان بەن لە چنیندا. |

| | | |
|---|---|---|
| پەلاتیقە | هەلێر | مەرایی کردن. گومان دەکەم لە (پۆلەتیکەو)ە وە وەرگیرابێت. |
| پەل | هەولێر | بەکەسێك دەگوترێ، زۆرجار کەتنی لە دەست رووبدات. |
| پەڵاس | | جلوبەرگی شڕ و دڕاو. |
| پەڵپ لێ گرتن | | ورك گرتن، گرنە لێ گرتن، جەڕنەگە گرتن، بەهانە. |
| پەی | ئامەدە | لە دوای. لە پاش. |
| پەلیار | | گورج، بەدەستوبرد، نموونە: (پیرۆز ژنێکی پەلیارە). |

| ت | | |
|---|---|---|
| تابیە | تومەرە/ بالیسان | سەنگەر. چاڵێك بۆ خۆتیانان لەبەرەی شەڕدا. |
| تاس | | زات کردن. وێران. جورئەت. |
| تاسب | | قولاغ، گیانەوەرێك یان کەسێك کە گوێی رادێراوە. |
| تاسوق بوون | دەشتی هەولێر | تامەزرۆ بوون. تاسەوار بوون. حەز چوونە شتێك. |
| تاڵشت | | شنگ. هێز. وزە. توانا. تاقەت. |
| تانۆك | دۆڵی بالیسان | پەرژینێکی چڕ چنراو بەشولکە و دوایی بەقوڕ سواخ دراو. |
| ترکزە | هەولێر | شوێنێکی ناجێگیر. خەریکە ببێ، خەریکە بقەومێ. شتێك ناجێگیر بێت و خەریك بێت بکەوێت. |
| ترکژن | هەولێر | دەنگێکی نزم. لە ئەنجامی بەریەك کەوتنی دوو شت. یان کەوتنە خوارەوەی شتێك لە بەرزی. |
| تسیار | بناری کۆسرەت | راوکردنی ماسی بەشەو. |
| تفر | هەولێر | توێکڵێکی تەنك و باریك. پێستی مردوی دەست کە دەکەوێ. پێستی سوتاو کە هەڵدەدا و دەکەوێ. |
| تەقەتکردن | هەولێر | حەشاردان. شاردنەوە. |
| تك نەدان | | دانەکەسان. نەوەستان وازنەهێنان. لێنەگەڕان. |
| تورخاندنەوە | هەولێر | پلێشاندنەوەی شتێکی نەرمی وەك میوە تا ئاوی لێدەردەچێ. خراپکردنی شتێکی نەرم. |
| توریدی | بەرانەتی | تۆران. تەرەبوون. جارێکی تر رونەکردنە هەمان شوێن. |

| | | |
|---|---|---|
| توز | دەشتی هەولێر | ناخ و جەوهەری مرۆڤ، نموونە ئەو توزی خراپە بۆیە وادەکات. |
| توخن کەوتن | هەولێر | لێنزیك بوونەوە. (هەمیشە لەباری نەرێ بەکار دێت) وەك: نەمگوت توخنی ئەم کارە نەکەوی. |
| تورەزمان | | بەواوێکی زۆر کورت دەگوترێ. کەسێکە کە جگە لە پیتی (س) یەکێکی تر لە پیتەکانی بۆدەرنابڕدرێ. |
| توندگر | | یان توندگیر . کەسێکە لەسەر باوەڕی کۆنی خۆی سوورە. کەسێکی خۆندەمیتال. |
| تۆسن | بەڕانەتی | تورە، کەسێکی مۆن و هەمیشە تورە. |
| تۆراف | | گەنج. لاو. جحێل. تولاز. خورت . |
| تەپك کردن | گەلاڵە | جۆرێکی راوە. بەپێش گرتن لە گیانەوەرێك و تاراندنی بۆ شوێنێکی هەڵەموت و توشی هەڵدێران کردنی |
| تەڕاوز | | گەنمی درەنگ چێنراو. |
| تەڕدەست | هەولێر | لێزان. وەستا لە کارەکەی. کەسێك دەتوانێ بەدەست فروفێڵ بکات. جادوکردن بەدەست. |
| تەڕکاڵ | | تەڕاوز |
| تەریفە | بالیسان | کەسێکی داماو. خەمبار. لە رواندز بە کەسێکی زۆر تێنودەڵێن |
| تەڕەمز | سەرگەڵو | لە جیاتی پارە. خواردن یان شت بە کرێکارێك دەدەیت کە کارت بۆ دەکات. هەندێجار دەڵێن (تەڕەمزە) و لەگەڵ پارە دەبێ خواردنیش بە کرێکارەکە بدرێت. |
| تەڕکەجۆل | گوڵان/ شاور | هەرزەکارێکی کەتەو بەژن بڵند. |
| تەژە | | ریزێك دارەلەسەر شەقڵەدادەندرێ بۆ گرتنی سەری خانو. |
| تەژگ | وەرتێ | بەڕە، یان مافورێك کە ئەستور رستراوەوچنراوە |
| تەمار | | لەمپەر |
| تەمالکردن | | دۆزینەوەی شوێنی خۆشاردنەوەی کەروێشکی کێوی بۆڕاوکردنی. |

| | | |
|---|---|---|
| تەمسەر | رواندز | کەسێکە بایەخ بەشت نادات، کەسێکە بەلایەوە گرنگ نییە چی دەبێ. (لا ابالی). |
| تەمۆخ | دۆڵی خانەقا | بەردێکی نەرم کە بەدەست بشکێ. بەردی رزیو. بەردی نیشتو. |
| تەمەرك | باڵەکایەتی | کەسێکی لامل. کەسێکی رق نەستور. کەسێك رقی دانامرکێ. |
| تەوسکە | وەرتێ/ بالیسان | هەنجیری کێوی |
| تێبون | خۆشناوەتی | تێکەوتن. تێوەگلان. بەسەرداساغ بوونەوە. |
| تێپ | باڵەکایەتی/ باڵەیی | جار. کەرەت. |
| تێوەنزبوونەوە | بەرانەتی | چاوتێ برین بەنیازی شتێك. چاودێری کردن لەشتێ بۆ مەبەستێك. |
| تەیمان | خۆشناوەتی | چیل. چیلە. پەرژینی لە چیلکە و لقی دار دروستکراو. |
| تێسو | تومە/ بالیسان | سابونۆکە، رەگی روەکێکە لە ئاو کەف دەکات و بۆ جل شوشتن بەکار دێت. |
| تیرەگ | بەرانەتی | دیرەگ. کۆلەکە. ئەستوندە. دووگوێ. ستون. |
| تێرەقە | هەولێر | بربرە. گازەرای پشت. |
| تیتك | | پرچی تێك ئاڵۆزکاو شانەنەکراو. پرچی ناشرین. |
| تێروهاتن | هەولێر | پەلاماربردنە سەر. لە پڕ پەلاماردانی شتێك و بردنی. |
| تۆتکە | هەولێر | نەجولان لە شوێن خۆی. ئۆقرە گرتن، بە چەسپاوی مانەوە. |
| ج | | |
| جارس | هەولێر | بێزار. وەرس. |
| جامباز | هەولێر | ئەوکەسەی پارە دەگۆڕێتەوە. (مچارب) |
| جۆنیت | وەرتێ | لەندەهۆر. گەلۆر. کەسێکی لاشە گەورەو گێل. |
| جیلۆ | کۆیە | غەریبەیەك. بیانییەك کە پێی شەرم نەبێت بۆ پەیداکردنی نان و رۆژی. هەرکارێك هەبێت بیکات. |
| جێوار | شاور | جێ هەواری کۆن. |
| جێچارە | دەشتی هەولێر | جێی ئومێد. کەسێك کەجێ هیوای کەسانی ترە. |

| | | |
|---|---|---|
| جێوەڕێ | گەلاڵە | هەر لە شوێن خۆی سوورانەوە. (مراوحە). |
| جەندیلە | گـراو، خۆشـناوەتی | هەمبانەکە. هاوینان ئاوی تێدەکرێت تا سارد بێتەوە. کونێکی تێکراوە و قامیشێکی تێخراوە بۆ ئاو دەرچوون. |
| جەرنەگرتن | هەولێر | جەنەگرتن. پەڵپ گرتن. بیانوگرتن. |
| جەلەکردن | مەنگوڕایەتی | بەدوای یەکدا ڕێکخستن. ریزکردن (رەدیف کردن). |

| | | |
|---|---|---|
| ف | | |
| فتلان | نسێبین | وەرسوورانەوە. |
| فسلۆق کردن | بەرانەتی/ هەولێر | سەر لە سەرنەکردنەوە. بێزارکردن. وازلێ نەهێنان. |
| فرموز | توتمە/ بالیسان | دەموچاو |
| فرێزانەوە | وەرتێ | لەبەرکشانەوە و خۆئامادەکردن بۆ پەلاماردان، یان پـازدان یان بەرد هاوێشتن. |
| فسەزمان | هەولێر | کەسێکی گیرەزمان کە تەنیاپیتی (س) دەکات بە(پ). |
| فەتساندن | ئامەد | خنکاندن. هەناسە لێبڕین. |
| فەراك | وەرتێ | گیان. رەوان. روح. بۆ نموونە بەبەردێکی فەراکی لەبەربڕی. |
| فەناتی بە | باڵەکایەتی | وون بە لەبەرچاو. (هەرەشە و جوێنە). دەفن بە. |

| | | |
|---|---|---|
| چ | | |
| چاتی | هەولێر | بانی ئەوخانوەی کە(ئاسنەرا)دەکرێت. |
| چاوە خانو | هەولێر | خانوەیەك تەنیا یەك ژووربێت. |
| چایر | بۆتان/ نسێبین | لەوەڕگە. شوێنی ئاژەڵی لێ چەراندن. |
| چرگەڵان | دۆڵی خانەقا | چەقێن. پارچە زەویەکە کەبەکەڵکی کێڵان نایەت. |
| چرك | خۆشناوەتی | جۆرێك کەتیرەیە. لە کوڵاندنەوەی دووبارەی سریاتی تری دروست دەکرێت. |
| چرکە | بەرانەتی | گیایەکی زۆر وردە لـە مەرتاشـەبەردی شـێداردەروێ و وەك مافور بەیەکەوە نووساون. |
| چرکسان | دەرگەڵە | ئەوچەوریەی لەکاتی دروێنەدا هەسانی پێ دەسون |

| | | |
|---|---|---|
| چوونەمیلیّ | رواندز | راوە کەو کردن بەداو. هەمان کار لە(پیرۆپیّیان دەگوت(چوونەمەسەبیّ). |
| چلك | کۆبانیّ | میتك. بەلوکە. |
| چکۆلکردن | | لیّك جیا کردنەوە. پۆلیّن کردن. |
| چما | وەرتیّ/ بەرانەت | بۆچی. لەبەر چی. |
| چمارە | وەرتیّ | پەلامار بۆ هیّنان لە لایەن سەگەوە. |
| چمە | سەریّ کانییّ | دۆمبەلاّن |
| چەمۆلە | | گمشکە. |
| چەمارۆگرتن | گەلاّلە | سەگ کە شەوانە لە جیّگای خۆی دەوەستیّ و بەشتیّکی نەبینراو دەوەریّ |
| چەماژۆ | | بنەبڕکردنی. قەلاّچۆکردنی. نەهیّشتنی شتیّك. |
| چنگوەر | بلەیسەریّ/ خەلیفان | پەککەوتو. معوق. |
| چوونەکەوشان | بالّەکایەتی | چوونە ریّواس و کنگر کردنی کچان. |
| چویزە | | پیّستی موولیّ کەوتوی روو یان سەر. نەخۆشی (داو الپعلب) |
| چیچك | ئامەدە | ناوکی میوەی ناوکدار. کرۆك. ناوەرۆك. |
| چیّشتانە | هەولیّر | ١- بەفشیش. ٢- خواردنیّ یان ژەمیّك کە خاوەن کار سەرەرای کریّ. بەکریّکاری دەدا. |
| چیم | | چرگە. گیایەکی وردی وەك مافورە. |
| چەپرەك | هەولیّر | دەستە پاچە. پەککەوتو. ئفلیج. |
| چەکلەر | هەولیّر | گیانەوەری لەڕو لاواز. |
| چەلّەگ | رانییە | داریّکە دەدریّتە بەریەتی رەشمالّ بۆ راگرتنی |
| چەورکردن | هەولیّر/ بەرانەت | هەویّرکردن. لیّك جیاکردنەوەی بەرخ و مەڕ. |

| | |
|---|---|
| خ | |

| | | |
|---|---|---|
| خارزك | | زۆرخۆر. |
| خاریلكه | | سست و خاو. |
| خرچان | | پارچه گەچ. |
| خڕگۆڵ | وەرتێ | بەرغەبابە. گۆشتی ژێرچەنەگەو گەردن. |
| خزان | سەرێ كانیێ | نەدار. زۆر هەژار و پەرپوت. بار بەسەری كۆمەڵگا. |
| خلگۆن | وەرتێ | كەسێكی مل ئەستور. یان پێستی گەردن شۆربودوه. |
| خلوت | هەولێر | سێ سوچ. سێ گۆشە. |
| خۆرا | گەردەوان/ رواندز | زۆرخۆر. |
| خواشه | گەلاڵە | چروی لەسەر یەك داندراو. تابۆسەر خانودانان وشك بێتەوه. |
| خواشەكردن | باڵەكایەتی | ئابلوقەدان. |
| خواشكەدان | گەلاڵە | خواشه كردن. ئابلوقەدان. چواردەورگرتن. |
| خۆرنەوازان | | هەرشتێك كەتیشكی خۆر نایگرێتەوه. |
| خۆشاو | خۆشناوەتی | ئاوی مێوژ. |
| خۆلیس | دۆڵی شاور | تف. خوزی. |
| خوزی | بەرانەتی | تف. خولیس. |
| خۆلەگورەنە بردن | بەرانەتی | خۆنەجولاندنەوە. پشتگوێ خستن. گوێ پێ نەدان. |
| خلو | بەرانەتی | ڕاهاتن لەگەڵشتێ. هۆگربون بەكارێك. دەگوترێ (خلوی پێوەگرتووە وابكات). |
| خوو خده | بەرانەتی | خدو. راهاتن. نەریتی كەسێك یان كۆمەڵێك. |
| خونده | | تامەزرۆ. |
| خوسار | | زوقم. خوناوی بەستو كەرەنگی وەك بەفر دەبێ. |
| خوساندن | ئامەد | تراشین. هەرودها لەئاو نەرم كردنەوه. |
| خوس كردن | | خۆدانەواندن لە ترسان. خۆنزم كردن لە ترسی گولله یان پارچه بەركەوتن. |
| خیچ كردن | | ڕاست كردن ومشت كردنی ریەی گەنم بەدەرماڵ. |
| خێزەره | | چلو. |
| خیناوڵ | باڵـەیی/ | خـوێنگرتنی نـەخۆش. بەقۆچـی ئـاژەڵ |

| | | |
|---|---|---|
| | باڵەكایەتی | (جۆرەچارەسەركردنێكی كۆنەبەخوێن دەرهێنان). |
| خوێرسك | بناری قەندیل | ئەوشوێنەی (تاتەبەردی) كە خوێی لەسەر. رووەدەكەن بۆئەوەی ئاژەڵ بیخوا. |
| خێزر | دۆڵی خەلەكان | دارستانی چڕی بەڕوو. ژمارەیەكی زۆر دار بەڕووی وەك یەك. |
| خێزەربەستن | | بەریز راوەستان. بەدوای یەك دا دانان. |
| خەپاڵ | وەرتێ | ژنێكی پان وقەڵەو. |
| خەرەوە | دێ ی عەسكەر | جۆرەنانێكە كە ئاشەوان لە ئاردی خەڵك بۆخواردنی خۆی دروستی دەكات. نانەكەنارێك و ئەستوروخاوە. چونكە لە ئاردی تێكەڵاو و بەنەزانی بەپەلە دروست دەكرێت. |
| خەفەتخان | بەرانەتی | كەسێكە خەم لە هەموو شتێك دەخوات. كەسێك كە هەمیشە شتێكی هەیە پێی خەمبار بێت. |
| خەرۆ بوون | | مەغرور بوون. بەڵام دەستخەرۆدان واتا تەفرەدان. |
| خەزەڵ | | گەڵای ئاسكی تازە. |
| خەنی بوون | هەولێر | ئەو پەری خۆشی. بەكامی دڵ گەیشتن. |
| خەم سارد | هەولێر | كەسێك كە زۆر گوێ بەشت نادات. كەمتەر خەم. |
| خەورین | ئامەد | بورانەوە لە هۆش خۆ چوون. |
| خلە | دەشتی هەولێر | خەرمان. زۆر جار وەكو وشەیەكی لێكدراو لەگەڵ خەرمان بەیەكەوە دێن و دەبنە (خلەوخەرمان). |

| | | |
|---|---|---|
| ح | | |
| حەپەرۆز | شەقڵاوە | چەمارۆ. سەگ پێوەرین. |

| | | |
|---|---|---|
| د | | |
| داخون كردن | بتوێن | بردنە ژوورە. خستنە ناو(أدخال). |
| داشت | هەولێر | گیانەوەرێكی مام ناوەندی (نەزۆرباش و نەخراپ) وشەی (نیوداشت)یش هەیە كە مەبەست لە شتی بەكار هاتووە. شتی دەستی دووەم. |

| | | |
|---|---|---|
| داڵوازه | بناری کۆسرەت | ڕێخۆشکردن بۆکردنی کارێ. مریشك کاتێ کە بەدوای شوێنی دەگەڕێ تا هێلکەی لێبکات. |
| داهێلان | کۆیە | شۆڕکردنەوە. |
| داکردنەوە | هەولێر | خستنە ژورەوە یان کولانەی پەلەوەر و گیانەوەری ماڵی. |
| دامیاو | وەرتێ | جۆگە ئاوی بەهاران کە لە بەفری تواوە دروست دەبن. |
| داروبلکە | تۆربە/ دۆکان | شەپۆلی ئاو. |
| درژ | | گرژ. |
| دمۆر | هەولێر | شوم. دمۆر لە (دوو مۆر) وەرگیراوە. واتا ئەوانەی دووخاڵی بلاّوبوونەوەی موو لە سەریان هەیە. واباوبوو ئەم جۆرە کەسانە بەشووم دادەندران. |
| دمهەراش | بیتوێن | قسەگەورە. بێشەرم. |
| دنەدان | | هاندان |
| دوبران | دۆڵی خانەقا | ئەوجۆگە ئاوەی دەبێ بەدووبەش. |
| دوڤ | سەری کانیێ | کلك |
| دواو | شاور | ئەوشوێنەی دووئاو یان روباری تێدادا پێکدەگەن. (شگ) |
| دۆبڕ | دەشتی هەولێر | ئەوکەسەیە کە هەموو مێگەلەکەی خۆی دەفرۆشێ. |
| دۆڵەمەڕە | خەتێ/ بالیسان | بێڵ. خاکەناس. خاکەنداز. خاکەنداس. |
| دمك | هەولێر | نووك. دەنوك |
| دەچ کردن | بیرۆ/ بالیسان | برین و لێکدانەوەی چلەپۆپەی روەك تاقەدەکانی تونـدو تـۆڵ و پتەوبێت. |
| دەرگسی | ئامەد | دەستگیران. دەزگیران |
| دەرکوت | | ئاسنێکە لە دەرگاداریەکۆنەکان قایم کراوە. بۆ لە دەرگادان لە جیاتی زەنگ لێدان. |
| دەرمـال کردن | دۆڵەڕەقە/ رانییە | چاندنی هەندێ سەوزەجات لەبەردەم ماڵ بۆ بەکارهێنان. |
| دەستاو | بیتوێن | قاپە ئاوێکە. ژن بۆ دەست تەرکردن لەکاتی هەویرشێلاندا لای خۆیانی دایدەنێن. |
| دەستەوایی | بیتوێن | هـاری کـاری یـەکتری کـردن لـە کـاری وەك دروێنـەو. . |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەردودزی. |
| دەستاو | رانییە | دەستکردی کەسێ. چێشتی دەستی کەسێك. |
| دەسکیس | هەولێر | جاسوس. چاوساغی کردن، فسوس. |
| دەربردە | | توانا بەسەر داشکان وتەواو کردنی کارێك. |
| دەستلایەز | دەرگەڵە/ رواندز | ئەوکەسەی لەبەر پیری یان نەخۆشی دەکەوێتە ناو جێگا و پەکی دەکەوێ. |
| دەستخەرۆ | هەولێر | تەفرە. بەهەڵەدابردن. فریودان. |
| دەغەز | دەشتی هەولێر | قین. رك |
| دەغەزەڵ | هەولێر | تەمبەڵ. لات. کەسێك هەمیشە پاڵ دەکەوێت. |
| دەقن | | جۆرە قورێکی قوڵ و پەیت کە مرۆڤ لێیدەرناچێ. |
| دەرخون | | سەری مەنجەڵ. قابلەمە. شتێکی پڕ کە چیتر جێگای نەمابێ. |
| دەڵاندن | بناری قەندیل | لێچوون. لێڕژانێکی زۆرکەم. (تسرب). |
| دەمەلاسکێ | | لاسای کردنەوەی کەسێ. |
| دەمدڕاو | | دەمشڕ. کەسێکە قسەی لاناوەستێ. نهێنی ناپارێزێ. |
| دەودنەچلو | گەلاڵە | کۆمەڵە چلویەکی پێکەوە نووساوە لەدوای خواشەکرانی. |
| دەنگۆ | | واتە وات. شت لەسەر بیستن (شائعە). |
| دەوساندن | ئامەد | فشار خستنەسەر. پاڵەپەستۆ پترکردن لەسەرشتێ. |
| دەوەك | | ئەوئەسپەیە کە باش دەتوانێ رابکات. |
| دەهۆ | مەهاباد | دەسیسە. درۆیەکی گەورە کە بەرنجامی خراپی لێبکەوێتەوە. |
| دیرەك | قامشلۆ | ئەستوندە. عامود. |
| دیودەر | | شتێك کە هەردوو دیوی دیاربێت وەك شوشە. نایلۆن. |
| دێراو | بیتوێن | بۆیە. یەك هێلی ئامادەکراو بۆ چەقاندنی شەتڵی توتن. |
| دێروخە | عەمدۆن/ شوان | لێك بەستنەوەی دێراو بەشێوەی پێچاوپێچ تا ئاودانی ئاسان بێت. |

| | |
|---|---|
| ز | |

| | | |
|---|---|---|
| زاكوماك | دەشتی هەولێر | مەڕو بەرخ یان بزن و كار بەیەكەوە فرۆشتن. |
| زاور | كەركوك | ئەوئاژەڵەی كە تازە زاوە. |
| زانەخرۆ | | زۆرزان |
| زراسكە | وەرتێ | مەلوتكە. قۆنداغ. منداڵی ساوا. |
| زوا | ئامەد | وشك. (زواكردن) بەواتای وشك كردنەوە دێت. |
| زیلك | قامیشلۆ | میتك. چلك. بەلوكە. |
| زیلەدار | باڵـــــــــەیی/ باڵەكایەتی | خەڵكێكی زۆر. حەشامات. قەرەباڵغ. |
| زێوان | پشدەر | پاسەوانانی گۆڕستان. |
| زێڕاو | بیرۆ/ بالیسان | ئاوی گوشراوی ترێ. |
| زەل | | قامیش |
| زەلك | | زلك. قەسەڵ. قەدی وشك هەڵگەڕاوەی گوڵەگەنم. |
| زەڵوت | نسێبین/ قامشلو | نزلە. سەری روتاوە. سەری بێمو (اصلح) |
| زەمرە | دەرگەڵە/ رواندز | ئەوكەسەیە كە لە كاتی كـاری بـە كۆمەڵـدا. خۆناداتـەكار. واتاخۆی دەگنخێنێ و باش كار ناكات. |
| زەنەك | | دەقنە. قوڕێكی زۆر و خەست كە لە ناوی دەرنەچێت. |
| زەمەند | بناری قەندیل | گیای جۆراو جۆر و تێكەڵاوكە لە یەك شوێن رواون. |
| زەواق | هەولێر | بێزار. وازی لێبێنە لە زەواقت نا(واتا بێزارت كرد). |
| ژ | | |
| ژوار | بیتوێن | ژان. ئازار. نموونە: دڵم بۆی ژوارێ دەكات. |
| ژەك | پشدەر | فرچك. یەكەم شیری مەمك دوای بەچكە بوونی شیر دەدات. |
| ژیار | شاور | بەجوڵە. كەسێكی زیندوو رانەوەستاو. |
| ڕ | | |
| راتەولاندن | گەرەوان/ رواندز | گواستنەوەی ولاخ لـە شـوێنێكی كـەم لـەوەڕ بـۆ شـوێنێكی باشتر. |
| راچاندن | خۆشناوەتی | بلاوكردنەوەی ریسی خوری بەسەر داری چەقێنراودا. |
| راچاندن | گولان/ شاور | ئاو لێ رشتن. ئاولێگرتن. |
| راچیتان | دەرگەڵە/ رواندز | لەسەر یەك دانان. |

| | | |
|---|---|---|
| راسانە کار | | دەست کردن بەکار. پەلاماری کاردان. |
| راقەنا | ودرتیٚ | مرد. گیانی دەرچوو. |
| راماڵ کردن | | پیٚداماڵین. سواخ دان. |
| رانان | باڵـــــــــەی/ باڵەکایەتی | بەرامبەر راگرتن. دەرخستنی شتیٚك بۆ بەراوردکردن. |
| راهیٚلان | گەلاڵە | راکیٚشان |
| رزۆت | | دەنکە تریٚی خراپ. |
| رساندن | دۆڵی خانەقا | هارکردنی میٚشهەنگوین لە پوردی خۆی. |
| رسم | گەلاڵە | ئەو بەردەیە کە لەژیٚر زەویە و جوتیا نایبینیٚ زۆر جا ئاموری لیٚ گیر دەبیٚ و دەیشکیٚنیٚ. نموونە: ئەورۆکە رسمەکە کەتە بەردمکی ئاموری. |
| رنا لیٚ گرتن | دەشتی هەولیٚر | جەنە لیٚگرتن. بوون بە مەراق لە شتیٚ. |
| رنە نەچوون | دەشتی هەولیٚر | رق نەنیشتنەوە. نموونە: ئەگەر ئازاو رنەی نەچوبی ئەو کارەی هەردەکات. |
| روار | بناری قەندیل | سیٚبەری دارستانی قەد پالان. |
| روچاندنەوە | بیٚرۆ/ بالیسان | ریشە کیٚش کردن. لەبن و بۆتەکەوە دەرهیٚنان. |
| روبین | | کەسیٚکە تەنیایەك دیو و سادە شت دەبینیٚ و لیٚکی ناداتەوە. |
| رودار | هەولیٚر | بیٚشەرم |
| رودان | هەولیٚر | زۆرگاڵتە کردن لەگەڵ کەسیٚ تا شەرمی لیٚت دەشکیٚ. نموونە: نەمگوت رومەدە ئەو منداڵە تاوات پیٚنەکا. |
| رۆچنە | | رۆژنە، کولانکە. |
| رونگ | | خوری مەڕی مردارەوە بوو. |
| رووهەڵڕیوون | بەڕانەتی/ هەولیٚر | تۆران. زیزبوون. دڵشکان. کەسیٚك جاریٚکی تر روو لە شویٚنی جاران نەکاتەوە. |
| رووسەکردن | بیتویٚن | ئاودنیٚ. خاکاو. |
| رەباس کردن | | تیٚر ئاوکردنی زەویەکی بەراوی چیٚندراو. |

| | | |
|---|---|---|
| ڕەپستەبوون | باڵەكایەتی | ١ - زووگـەورەبوون ٢ - ئـەو زەویـەی كـە كوتراوەتـەوە بەستراوە. |
| ڕەخش | باڵـــــــــەی/ باڵەكایەتی | وڵاخی بەرزە |
| ڕەدار | وەرتێ | نێری كە تەنیا یەك لاگونی خەسێندراوە. |
| ڕەژەك | سـەردەشت | زۆربڵێ. |
| ڕەقاو كردن | خەتێ | كرداری ڕەق كردنەوەی ئاسنی گەرم كـراو كـە كراوەتـە داس یان شتی تر. |
| ڕەن | دەشتی تەقتەق | پارچە زەوی (كێڵگە)ی دەم ڕوبار. (حاویە) |
| ڕەنگاو | هەولێر | خمی گیراوە لە ئاو بۆ ڕەنگ كردنی پارچەو جلوبەرگ. |
| ڕەقاز | هەولێر | ئەو بەشە بچووكەی خاك یان لوتكەی شاخ یان تاشەبەرد كە لە ناو گۆم و ڕووبارو دەریاچەدا بەدەردەوەیە. |
| ڕەشیشە | پشدەر | باڵندەیەكی ڕەش بە ئەندازەی كۆترە. |
| ڕەنجبێوەر | هەولێر | ڕەنـج بێبـەر. كەسـێكە ڕەنـج و مانـد و بـوونی بـەفیڕۆ ڕۆیشتبێ. بێ مایە. لاواندنەوەیە بۆ كەسانی جوانەمەرگ. |
| ڕەوتەنی | دەشتی هەولێر | سـەرپێی. بەسەرپێوە. بە شێوەیەكی كاتی و بەخێرا. |
| ڕینگۆڵ | دەشتی هەولێر | پچڕ پچڕ. (بۆ خوری مەڕ بەكار دێت). |
| ڕێژ | | گڵی سوور. گوایـا(گـڵاو، گـڵ+ئـاو)پیـسی و گـڵاوی سـەگ لائەبات. |
| ڕێژاڵ | پشدەر | جێگایەكی عاسی و هەڵەموتی شاخ كە ئاوی پیادا بڕوات. |
| ڕێسمەدان | | سـوورگی كردنـی دەرگـا. قفـڵ كردنـی دەرگـا. داخـستنی دەرگا. |
| س | | |
| سـاتگار كردن | وەرتێ | هەتك كردنی كەسێك بە بڕینی ئەنـدامێكی لەشـی وەك لـوت یان گوێ. یاخود بەتراشینی بـرۆو مـووی سـەر. سـاتگاركردن: تێكدانی ئادگاری مرۆڤـە وەك تۆڵە. |
| ساردنەوە | خۆشناوەتی | ئاو بەسـەر نەمامدا تێپەڕ كردن. |
| سام | بەڕانەتی | ترس. (بەسام) ــبەترس. |

| | | |
|---|---|---|
| ساکان | | تاسان. حەپەسان. |
| ساووڵ | دۆڵی خانەقا | بەردکێش. لەدار دروستکراوە بۆ کێشانەوەی بەرد بەپشتی وڵاخ. |
| سایەد | باڵەی | خلو. خووخدە. هۆگری. نموونە: ئازاد سایدی بەوکارەگرتووە. |
| ستنان | وەرتێ/ مەکێ | ئاو دەلاندنی ڕەشماڵ. دڵۆپە کردنێکی وردی ڕەشماڵ کە یەکەم بارانی پێدەکەوێ. دوای ئەوە کونەکانی بە ئاو دەگیرێ و دڵۆپە ناکات. |
| سرەمۆك | | مێوژی خراپ. |
| سمکە کردن | دەشــــتی هەولێر | بەدەست تۆ چەقاندن. لە جیاتی مەکینە یان پێوەر کردن. |
| سلۆرت | | خوێڕی. بێکارە. سەرسەری. |
| سنج | ئامەد | ڕەوشت. ئاکار. ئەخلاق. |
| سندۆڵ | قەڵادزێ | جۆنی. |
| سواڵك | ڕانییــــــە/ بیتوێن | تاسولقە. پارچەی شکاوی گۆزەو هیزە. |
| سواندە | هەولێر | گوێسەبانە. |
| سوخەت | دەشــــتی هەولێر | تیهاد. ناخ. هەمیشە بە(نەرێیی)بەکار دێت. وەك: هەی سوخەت پیس. |
| سوورتك | هەولێر | لوسکە. بەدڕەوشت. ئاژاوەچی. کەتنکەر. |
| سوورتە | باڵەی | دەنگۆ. قاو. (شائعە)نموونە: لەناو خەڵك سوورتەی پەلاماری سوپاهەیە. |
| سوور | هەولێر | بێگومان. بێ شك. نموونە: من سوردەزانم تۆ درۆ دەکەی. |
| سوکرا | ئامەد | خۆپاك کردنەوەی ئاینی(غوسڵ لە خۆ دەرکردن) نموونە: ئەز سوکرا خوەدکەم. |
| سول کردن | باڵەکایەتی | تیژ تێپەڕین. ڕاکردنی بەتاو. نموونە: مەڕەکان لە تینوان سولیان کردەسەر ئاوێ. |
| سۆلین | ئالانـــــەی | دارستانی چڕ. شیپەڕ. |

| | | |
|---|---|---|
| | دەربەند | |
| سۆزگ بوون | هەولێر | بەزگ دان. مردن بەداخی منداڵ یان نەوە مردن. |
| سوێ | | تخوب. سنووری خانوێك. سەرە سوچ. |
| سلۆرك | | قاپێکی بچووکە. رۆنی تێدایە بۆ چەورکردنی داس و چەقۆ. |
| سهنی | بەڕانەتی | پێستی سووری تازە هاتووەوەی دوای بڕین. پێستی سووری سەری کەچەڵ. |
| سەپکە | بەڕانەتی | پەپکە. ئەستورك یان کولێرەیەکی ئەستوری نیوەبرژاو. بۆسەگ دروست دەکرێت. |
| سەپکە | عەسمکـــــر/ ئاخجەلەر | ئەو کولێرەیەیە. کە بۆ ئەوەی زوو ببرژێ لەسەر ساج. پەنجەی تێڕا دەکەن و سەری چاڵ چاڵ دەبێت. |
| سەجرە | | سەرجەلە. رەچەڵەکی یەك بەدوای یەکدا هاتوی کەسێك. |
| سەراو | دۆڵی شاور | تەختە. چەند ماکاوێکی توتنە. |
| سەرەوەشێنی | رواندز | سەرلێشێواندنی ئاژەڵ. |
| سەرکردن | بیتوێن | قرتاندنی سەری نەمامی توتن. |
| ســـــــەری هۆگانێ | گەڵاڵە | سەرە سەددەی جوت. |
| سەرپەڵۆ | | رەتەڵ بردن. نسکۆ. ساتمەکردن. |
| سەر تۆپ | | لە هەمووان باشتر. یەکەمین پلە. |
| ســـەرهێنانە بەر | | سەلماندن. پەسەند کردن. پیێ ی رازی بوون. |
| سەرناس | | کەسێکی زوو ناس و زۆر خەڵك ناس. |
| سەلەم | بەڕانەتی | فرۆشتنی بەرهەمی چاندراو بە گۆترە پێش پێگە یشتنی. وەك فرۆشتنی گەنم پێش دروێنە. |
| سیپە | | دارێکە لەکاتی دانانەوەی نیشان، تفەنگی دەخرێتە سەر. |
| سیپارۆ | | تفرێکی سپیە لەسەر دەمو چاو دەمێنێتەوە دوای بەسابون شوشتنی. |
| سێرو | قەڵادزە | ریشۆڵە. رەشۆڵە. |
| ســـــەقا | | دەمەزەوکردن. تیژکردنەوەی دەمەداس و تەورو خەنجەر. بەگەر |

| | | |
|---|---|---|
| کردنەوە | | کردنیان لە کورەی ئاسنگەر. |
| سێد کردن | بێرۆ/ بالیسان | جووت کردن. |
| سینگۆری | خۆشناوەتی | شیشی گۆرەوی چنین. |
| سیوار | دەشتی هەولێر | سەلیقە. زەوق. نموونە: یاری ناکەم. سیوارم نییە. |
| سینگە هەپە | وەرتێ | پیاوێکی کورت و قەڵەو. |
| سیپاڵ | | جلکی سواوو کۆن و دارزاو. |
| سیلە | هەولێر | سێرەی تفەنگ. دیوی دەرەوەی گۆشەیەك. پێچەوانەی (سوچ)کە دیوی ناوەوەی گۆشەیە. نموونە: لە سیلەی خانوی سەیری کۆڵان دەکات. |

| | | |
|---|---|---|
| ش | | |
| شاتان | گەلاڵە/ باڵەکایەتی | لقە دارێکی درێژو راست. نموونە: ناژاڵی ئەو دارسپیندارەی شاتانی باشن. |
| شاگە | | شاگە زەلام. فیتە زەلام. لەندەهۆر. زۆر گەورە. |
| شارۆ کردن | مەریوان | چنینەوەو هەڵگرتنەوەی پاشماوەی رەزو باخی چنراوە یان گوێزی وەشاو یان گوڵە گەنمی لە دروێنە بەجێماو لە لایەن کەسانی نەدارەوە. |
| شلال بوون | هەولێر | زۆر هیلاك و ماندوو بوون. |
| شلال کرد | هەولێر | بە تەقەڵی گەورە دوورینی شتێك. |
| شلێف | خۆشناوەتی | جەواڵی زۆر گەورە بۆ گواستنەوەی کا رەشکە. |
| شو وەشێن | وەرتێ | ئەوکەسەی بەشولکێکی (دارێکی) درێژ گوێز بەردەداتەوە. |
| شونك | | کوتکێکی دارە. ژنان لەسەر کانی و رووبار جلی پێدەشۆن. جلەکە بەتەڕی دەکوتنەوە تا پیسی لێ دەربچێ. |
| شویتك | خۆشناوەتی | شوێنەواری شتێ. ئەسەری بەجێماوی کەسێ یان شتێ. |
| شۆدان | رواندز/ هەولێر | سوینی دیوی ناوەوەی کلاوی تازە درواو بەهەویر، تا رەق و پتەو بوەستێ. |
| شنگ | هەولێر/ | توانا. وزە. تاقەت. |

| | | |
|---|---|---|
| | بەڕانەتی | |
| شۆڕ | قەراج | ئەو ناوەی قامیشەلانی لە دەورە. |
| شوڕ | هەولێر | باری تەندروستی زۆرخراپ. لەسەرەمەرگ. |
| شڕ | هەولێر | زۆری لێبرد کەمی هێشتەوە. |
| شمك | بۆتی هەولێر | شونك. گەراكوتك. كوتكی جلك شوشتن. |
| شەبەش | سەرێ كانیێ | شوتی. شفتی. |
| شەتاندن | | لە كاتی ژانسەری توند. سەری كسەكە زۆر توند بەبەن یان بەنەخوێن (دۆخین) دەبەسترێ تا ژانی دەشكێ. |
| شەگاڵ | وەرتێ | بەجلكی ماڵەوە بوون. بەجلكی خەوەوە. وەك: كراس و بێجامە. دەرپێی سپی. دزداشەو شۆرت. نموونە: جارێ شەگاڵم. باخۆ بگۆڕم ئینجا دێم. |
| شەرم لێتەرین | | شەرم لێ شكان. |
| شەلاندن | ئامەد | چوونە سەر شوێنێك بەچەكەوە بۆ دزینی. |
| شەنگوڵە | كانی شۆك/ سورداش | جمكە. جمك. دووانەی سكێ. |
| شیرەت | ئامەد | ئامۆژگاری. |
| شیپەن | بنار كۆسرەت | بنەگیای چرو پرو گەورە. |
| شیپەڵ | بیتوێن | توتنی كارتەكراو. |
| شەمەرتە | | داری وەك كەزێ و پەلك هۆنرابێتەوە. |
| شیپەڕ | بەری مەرگە | دارستانی چڕ. جەنگەڵ. |
| شیلە | | ددانی دواوەی ولاغ. گەر ولاغەكە لە چوار ساڵ گەورە تر بوو شیلەی دەكەوێ و بەپیر دادەندرێت. |
| شیلك | بەڕانەتی | شیلكی سەر. بەشی دواوەی كەللەسەر. |
| شیوار كردن | دۆڵە رەقە | چێشت بردن بۆ ماڵە هاوسێی تازە. چێشت بردن بۆ پرسە. |
| شەویلكە | باڵەی/ باڵەكایەتی | هێلانەی سمۆرە. ئەو كونە دارەی سمۆرە شەو تێدایدا دەمێنێتەوە. |
| شەرت | دەشتی هەولێر | قسە گەیاندنەجێ. پەیمان بردنە سەر. تەواو كردنی كار بە |

| | | |
|---|---|---|
| هەڵاتن | | گوێرەی رێکەوتن و کۆنتراکت. نموونە: ئەمن شەرتم هەڵات واتا پەیمانی خۆم بردە سەرو کاری خۆم وەك پێویست تەواوکرد. |
| شەوادی | رواندز | پێرێ شەو |
| شەوێ دی | رواندز | دوێنێ شەو |

| | |
|---|---|
| ق | |

| | | |
|---|---|---|
| قاشاو کردن | خانەقین | خوراندن و شانە کردنی (داهێنانی)پشتی ولاغێکی تازە پشتکراو تا توکی سەر پشتی لابچێ. ئەم کارەبە تەنەکەیەك دەکرێ و کە بە بزمار کون کون کراوە تا لاکەی تری زبر و درِ بێت بۆ ئەم کارە. |
| قاشو | بناری کۆسرەت | درەختی دووساڵە. ئەو نەمامەی ساڵی بەسەردا سووراوەتەوە. |
| قان | | یەکە یەکی بچووکی پێوان بووە. |
| قان پێدان | هەولێر | لێبوردن. جارێکی تریش بوارپێدان. رێگا پێدان دووبارە یاری کردنەوە لە یاریدا. |
| قانەبرا | هەولێر | ئەوبرایەی کە خۆژیە. تەنیا بەرژەوەندی خۆی دەوێ و گوێ بەخوشك و براکانی نادات. |
| قاقلە | خەلەکان | هەنجیری نەگەییو. |
| قانلرِ | بەرانەتی | یەخە بەرنەدان، رکەبەری کردن لەگەڵ کەسێ یان شتێ. نموونە: ئەوە بۆ قاندری ئەو کورەبووی شەری لەگەڵ دەکەی؟ |
| قاو | | دەنگۆ. سوورتە(شائعە). (بۆنەرێتی)بەکار دێت وەك: بۆی لەقاوداو ئاشکرای کرد. |
| قاوێ بوون | باڵەیی/ باڵەکایەی | رزی بوونی دار. کرمێ بوونی دارو درەخت |
| قایل بوون | هەولێر | رازی بوون. پەسەند کردن. |
| قرۆمە | دۆڵی خانەقا | بە منداڵێکی قسەزان و زۆرزان دەگوترێ. |
| قوچەك | دەشتی هەولێر | ئەو بەروانەی لە کێڵگە بژار دەکرێن. لە شوێنێك کەڵەکە دەکرێن و پێی دەڵێن قوچەك. |

| | | |
|---|---|---|
| قوچەوڕ | | هەڵەوڕ. ئەو کەسەی قسەو هەڕەشەی زۆر دەکات بەڵام بەکردەوە هیچی لەدەست نایە. |
| قۆرخ کردن | | پاوان کردن. مۆنۆپۆل کردن. دەست بەسەر داگرتن. |
| قوتار کردن | هەولێر | ڕزگار کردن. دەرباز کردن. |
| قۆلکە | بناری کۆسرەت | ئاگردانێکە لە زەوی هەڵکەندراوە. |
| قورتم گرتن | | دەست لە ئەوك نان. دەست لە گەرونان. ڕێگا لێ برین. |
| قونار | بلەکێ/ بانە | هەڵپەرداوتنی داری مێو. برینی گەڵاو لقی زێدەی مێو. |
| قونار | | ئەو لقەدارەی بۆ چاندن ئامادەکراوە (فسیلە). |
| قونەت لەخۆدان | وەرتێ | ورە بەخۆدان. غیرەت دانەخۆ. |
| قوول | مێردین | کون |
| قەتۆ | وەرتێ | مشار |
| قەتار | شاور | کوز. چەند دێراوێك بەیەکەوە. |
| قەڵەمباز | | (گفرە). بازدان بەسەر قۆناغێك. |
| قیپنە | وەرتێ | منداڵێکی خڕکەڵەو قەڵەو. |

| ك |
|---|

| | | |
|---|---|---|
| کادین | | لەوەدە |
| کاسنجی | کەرکوك | جۆرەجوینێکە. وەك تاوانبارکردنی کەسێك بە لە دین دەرچوون. واتاکەیم بەدورستی دەست نەکەوت. |
| کان | باڵەکایەتی | یان(کوان) بەواتای قونێر. |
| کاوێ بوون | باڵەیی/ باڵەکایەتی | دەردەدار بوون. عیللەت داربوون. بۆدارو درەخت و روەك. |
| کایەڵ | باڵەکایەتی | پشتگوێ خەر. بایەخ بەشت نەدان. (اهمال). |
| کت | ئامودە | ئفلیج. چنگوەر. پەککەوتە. عەمەلەندە. سەقەت. نوقسان. |
| کرۆش کرۆشکە | سەقز | کرکراگە. ئێسکە نەرمە. |
| کرۆژ کرۆژ | گەلاڵە | کرکراگە. ئێسکە نەرمە. |

| | | |
|---|---|---|
| کرۆشەبەفر | باڵەکایەتی | بەفرێك کەسەرەکەی نەرمەو نەبیەستوە. |
| کرش وکاڵ | بەرانەتی/ هەولێر | زبڵ. پاشماوەی بژاری گەنم. خۆڵ و پوش وپەلاشی دوای گسك دان. |
| کرتۆپە | بەرانەتی/ هەرکی | پەتاتە. یارلماسی. |
| کزو | باڵەی/ باڵەکایەتی | خۆتێکوتان. بەخێرایی بۆ هاتن. (انقچاچ). وەك: هەڵۆیەکەم بینی کە چۆن کزی کردە کەوێك. |
| کنانەوە | | لاچوونی تفرو توێکڵی سەردوەی خاك کە دەبێتە هۆی بێپیت بوونی خاکی دەمەشۆڤل لێدراو. |
| کناچە | | دەنگی پۆر. |
| کووس | گوڵان/ شاور | ئاوی دێراوی توتن. |
| کوندەلان | | کە پرێکە کوندەی ئاوی خواردنەوەی لەسەر دادەندرێ. لەبەر فێنکی سەگ لەژێری پاڵدەکەوێت. وەکو مەتەڵ بەسەگیش دەڵێن (بەگزادەی بن کوندەلانێ). |
| کوتان | خۆشناوەتی | پەرژینی زۆر چڕ چێنراو. |
| کورەدەفێن | خۆشناوەتی/ خەتێ | کورە دەماندنی ئاسنگەر بۆ خۆشکردنی ئاگر. |
| کوژ | | چەکەرەی تازە تەقیو. |
| کۆستەك | | دەسکی خەنجەر. |
| کۆتەڵ | مەریوان | خاپەرۆك. پاشماوەی بژاری. گەنم. پوش و پەلاش. کۆتەڵ بەو پەیکەرەش دەڵێن کەشیعەکان لە عاشورا بۆحسێن و هاورێکانی دەیکەن و لە رێپێواندا بلندی دەکەن. |
| کولخان | | تونی حەمام. |
| کوڵەمر | باڵەی/ باڵەکایەتی | ئەو ئاگرەی خەریکە دامرکێتەوە و ژیلەمۆی نەماوە. |

| | | |
|---|---|---|
| کۆڵەس | دۆلّی جافایەتی/ شارستێن | غەلێفە. شانەی هەنگی مالّی. |
| کوك | سەریّ کانییّ | رەگ. |
| کوك | هەولێر | قوز. رێك پۆش. بەژن و بالاّ جوان. لاوێکی رێك. |
| کۆن | شێبین | رەشمالّ. چادر. خیوەت. |
| کوێر | گەردوان/ رواندز | یان (چوێر) ئەو ولاّغەی یان مرۆڤـەی کە نازانیّ لە رێگا بڕواو لاقی تێك دەئالیّ. خواروخێچ ریّ دەکات. |
| کەترە | بەرانەتی/ هەولێر | پەککەوتە. زۆر پیر. لەڕو لاواز و نەخۆش. |
| کەپولە | دەرگەلّە/ رواندز | قاپێك یان قوتویەکی پێوانە لای ئاشەوان، مزاشی پیّ دەگێرێتەوە. مزاش حەق دەستی ئاشەوانە. |
| کەرەمسۆ | وەرتیّ/ دۆلّەرەقە | خۆ گنخێنەر. خۆ لە کار دواخەر. کەسێك کە خۆی ناداتە کارەکانی. |
| کەرێجەبازار | کەلێتە/ بناریکاروخ | کەرێزە بازاڕ. |
| کەرێزە بازار | شنۆ/ ناوهەرکیان | ئەو بازارە کاتیەی کە لە رۆژێکی دیاری کراوی حەوتەدایان هەندیّ جار مانگیّ دا بەرپا دەکریّ. |
| کولافە | رواندز | قەلّس. |
| کەژەلّ | وەرتیّ/ خانەقا | پەسیرەی بە دارەوە وشك بوو. |
| کەسپ | وەرتیّ | دەستوورو نەریتی جلك پۆشین. نموونە: کەسپی ئێمە و عەرەبان لە یەك ناچن. |
| کەشکە | وەرتیّ | تینی شاقولّی هەتاو. نموونە: ئەو منداڵەت بۆ لەبەر کەشکەی تاوێدا ناوە؟ |
| کەلّوەز | گەرمیان | کەلّبەز. راز. هەنوان. نوان |

| | | |
|---|---|---|
| کەشیرە | دۆڵەکۆگە/ قەندیل | پەیوەست. بەیەکەوە نووساو (مترابگ)، نموونە: مێردم دوو پەنجەی پێی کەشیرەن. |
| کەڵکەڵە | دۆڵە روت | حەز چوونە شتێ. بیرکردنەوە لە کارێ یان شتێ (نزوە) |
| کەندو | بەرانەتی | عەمبار. ئەنبار. چاڵەگەنم. |
| کەندەوێ | دەرگەڵە/ رواندز | کێڵان و هەڵدانەوەی بنە مێوی ناو رەز لە بەهاراندا. |
| کەنسمە | پشدەر | کەندەسمە. باڵندەیەکی چکۆڵەیە. |
| کەلیندن | وەرتێ | ترازاندن. کردنەوەی دوگمە. دەرخستن. وەك: سوخمەکەت وەکەلینە (بترازێنە). |
| کەوشەن | دۆڵی خانەقا | جۆخین. شوێنی لێکۆکردنەوەی خەرمان. |
| کەودەر | | گێل. نەزان. کێوی. ناشارستان. گەوج. |
| کەوڕ | هەودیان/ دیانە | ماهی. هەڵەموت. شاخی سەخت و عاسێ نموونە: ئازاد لە کەوڕی کەت و قاچی شکا. |
| کەوەڕێ بوون | خۆشناوەتی | بێزار بوون. لە کارێك یان شتێك بێزار بوون. |
| کێسمە | دۆڵی هیران وناژەنین | نینۆك. زێدە گۆشتێکە لە لوتی ولاغ پەیدا دەبێت. |
| کیرۆڵە | سوورقاوشان/ سورداش | ئەندامی نێرینەی (پیتانی) گا. |
| کیناوی | | دڵڕەش. رق هەڵگر. (ماقود). |

| گ | | |
|---|---|---|
| گاگمە | ناودەشت | کۆتری کێوی. نەختێ لە کۆتری ماڵی و کوکوختی گەورەترە. |
| گالانەوە | وەرتێ | دەنگە دەنگ و شەڕە قسە لەسەر شتێکی پوچ و بچووك نموونە: ئەمە چیە ئەمەندە لەسەر ئەوەی دەگالێیەوە؟ |
| گرگن | سلێمانی | پیاوی چکۆڵەو ورگن. |

| | | |
|---|---|---|
| گرواندن | خۆشـــــناوەتی/ بەرانەتی | پێست لە گیانەوەر داماڵین. |
| گـــــرۆزە هێنان | دۆڵەڕەقە/ رانییە | گۆشت هێنانەوەو چاکبوونەوەی برین. |
| گشت | باڵــــــــەیی/ باڵەکایەتی | خڕ. بازنەیی. شتێك کە شێوەکەی بێ گۆشەو لول بێت. |
| گفت | هەولێر | بەڵێن. پەیمان. (وعد). |
| گلك | | پەنمان. هەر هەڵئاوسان و پەنمانێك لە لەش. |
| گلوەند | بەری مەرگە | پەتێکی خڕە دەخرێتە ملی وڵاخە بەرزە کاتێ کە بەهاران بۆ لەوەڕگا بەرەڵڵا دەکرێت. تا پایزان بە ئاسانی بگیرێتەوە، نموونە: جارێك لە مەرگە یەکێ پێی وتم: مامۆستا ئەوە بۆچی لە شارخەڵك گلوەند(کەرەوات) لە مل دەکەن؟ |
| گڵەماکە | دەرگەڵە/ رواندز | خۆڵێکی سپیە، لەگەڵ ترێ دەکوڵێندرێ بۆ دۆشاو دروستکردن. خۆڵەکە خڵتە و ترپەی ترێ دەنیشێنێ. |
| گوشەك | وەرتێ | بەور. ئەم وشە شیرینەی خۆمان بە شێوەی (وەشەق) چۆتە ناو زمانی عەرەبی و بە پشیلە کێوی دەڵێن. |
| گورگە مێش | مەنگوڕایەتی | ئەو سەگەی بە دزی گیانەوەر و پەلەوەری ماڵی دەگرێ و دەیخوا. |
| گوڕتە | دۆڵەڕەقە/ رانییە | پواز. هۆرە. وەرە. |
| گەڕاو | جەلی/ نازەنین | کانییەك ئاوەکەی تاڵ یان سوێر بێت. |
| گەرایشت | باڵەکایەتی | دەوروبەر. دەوروپشتی خۆت. |
| گەژا | وەرتێ | تەمەنی تەندروست و درێژ. نموونە: لە وەرتێ گەر منداڵ کارێکی باشی کرد پێی دەڵێن/ هەی بە گەژابی. |
| گەڵاکوت | کۆیلە/ باڵەییان | ئەو جۆرە دەرمانە میللیانەی کە لە گەڵای کوتراو دروست کراون. |
| گەلان | وەرتێ | هۆبەیەکی رەشماڵ لە کوێستان کە هەرەوەز و لەوەڕو شوانیان هاوبەشە. زۆر جار سەر بەیەك بنەماڵە یان تیرەن. وشەی (گەل) لە گەلانەوە وەرگیراوە. |

| | | |
|---|---|---|
| گەڵشك | گەلاڵە | دارێکی یان لقە دارێکی وشك و دڕکاوی و بە گەلاو قورسە، بۆ گرتنی دەروازەی هۆزی بەرخان بەکار دێت. |
| گەڵشك | دەرگەڵە/ رواندز | هەزرۆك. ئەو لقە دارانەی چڵو کە گەلاکەی بە ئاژەڵ دراوە. |
| گوان | بیتوێن | گۆشتی زیندوو( لە مرۆڤ و گیانەوەر) کە زەبری بەر دەکەوێ و رەنگی سەوز یان شین هەڵدەگەڕێ. دەگوێ. |
| گازدڕا | هەولێر | بڕبڕەی پشت. تیرۆقەی پشت. |

| | | |
|---|---|---|
| ع | | |
| عریتە | هەولێر _ کۆیە | قاقا. پێکەنین بە دەنگێکی زۆر بڵند. |

| | | |
|---|---|---|
| غ | | |
| غەنە | بەڕانەتی | بوار. مەجال. غەنەهەردەم بەنەرێی بەکار دێت واتا (غەنەنەدان) کە دەبێتە رێلێگرتن و بوار پێ نەدان نموونە: ئازاد غەنەی نەدامێ قسانی لەگەڵ بکەم. ئازاد غەنەم ناداتێ تێپەڕم. |

| | | |
|---|---|---|
| ل | | |
| لاباکردن | گەلاڵـــــــە/ باڵەکایەتی | لادانی تۆز و پوش و پەڵاش بە گسك لەسەر سۆرەی گەنم کە تازە لە بێژینگ دراوە. |
| لابازە | ناودەشــــــت/ قەلادزێ | لادان لە شارێ و بە لا رێ رۆیشتن. |
| لات | ئامەد | کەرتە شاخ. بەردی زۆر گەورە. |
| لاجامە | باڵــــــەیی/ باڵەکایەتی | لا شیپانە |
| لاشیپانە | | چوارچێوەی دەرگا. لاجامە. لە مەنگوڕایەتی دەڵێن سەردەر. |
| لامسەلایی | میرزارۆســــتەم/ رانییە | رابردەیی. هەر بەدەم رێوە. هەر بە پێوە. |
| لامل | هەولێر | عینادر. |

| | | |
|---|---|---|
| لاوژە | باڵەکایەتی | ئەرێ؟ ئایا؟ بۆ پرسیار کردن بە کاردێت. |
| لایەز | دەرگەڵە/ رواندز | ئەو دارە باریکانەی لافاوی رووبار لەگەڵ خۆی دەیانهێنێ. |
| لۆقە کردن | | سست و خاو رۆیشتن. بە ئەژنۆ شلی رۆیشتن. |
| لەچـــــون چوون | گەلاڵـــــــە/ باڵەکایەتی | رووچوونی زەوی. (انزلاق). |
| لەچەر | | چاوچنۆك. پیسکە. رەزیل. رژد. |
| لــــە خـــۆ خەفتی | بەڕانەتی/ هەولێر | را لە خۆ. بایەخ بە خۆدەر. کەسێك کە حەز لە جلی جوان و خۆ جوان کردن بکات. |
| لە تەرەدان | بیتوێن | داپۆشینی گەلای توتن تا زەرد ببێ. |
| لە رو چوون | باڵەکایەتی | کەو بێران. ئەو کەوەی دوای دۆڕاندنی شەڕ لەگەڵ کەوی شاخی. چیتر ناوێرێ بخوێنێ و بە کەڵکی راوە کەو نایێ. |
| لەوتن | وان/ هەکاری | پیس بوون. لەوتیە. پیس بووە. |
| لەوێشکی | پشدەر | لە کاتی. هاوکات. |
| لامژی | خۆشناوەتی | ئەو کارەی جگە لە شیری دایکی. شیری بزنی تریش دەمژێ. |
| لیتراو | هەولێر | قوڕاوی زۆر شل. قوڕاوی کاتی بارانی زۆر. |
| لێزنگ | ئامودێ/ کۆبانێ | داری سوتان. دار بۆ خۆ گەرمکردنەوەو چێشت لێنان. |
| لـــــــێ بانینەوە | بەڕانەتی | وەرگرتن و کردن بە هی خۆی. کاتێ کە بە گێژ کردنی مریشکێك جوجەلەی بێ دایکی تری دەخرێتەبەر. کاتێ کە بە چاو بەستن و دروستکردنی زانی ساختە بۆ مانگایێك، گوێرەکەیەکی بێ دایکی دەخرێتەبەر. (تبنی). |
| لێقەڕاندن | ئامە/ دەنسێبین | واز لێ هێنان. لێگەڕان. تەرك کردن. |
| لیمە | باڵـــــــەیی/ باڵەکایەتی | نیوەخشت. کەرتە خشتێك. |
| لاوین | | شۆڕەبی. شەنگەبی. |

| | | |
|---|---|---|
| م | | |
| ماخۆ | پـــــــشدەر/ خۆشناوەتی | خاوەن. |

| | | |
|---|---|---|
| ماردەخۆر | رواندز | چلکاوخۆر. خۆ فرۆش. بەکرێگیراو. |
| مارِە | دۆڵەرِەقە/ رانییە | کەسێکی نیاز خراپ. (محەنەت). |
| **ماسول** | وەرتێ | جولەی بە شەپۆلی سەرگرِی ئاگر. کەروێشکە و جولـەی گوڵـە گەنم بەبا. بۆ بیردۆزەی جولەی بەشە پۆلی گەردیلە گونجاوە. |
| ماسەر | وەرتێ | مشتاخ. |
| ماکاو | دۆڵی شاور | کەرخە. چەند قەتارێك بەیەکەوە. |
| ماهی | وەرتێ | کێویکی سەخت و عاسی و بێرێگا. هەڵەموند. |
| ماودر | دۆلی خانەقا | بەردشکێن. کوتکێکی ئاسنە. |
| **مت بوون** | هەولێر | سرِبوون. نەجولانەوە (سوبات). |
| مرخە | | دارێکە لە جیاتی باریە بەکار دێت. |
| مـــسری گۆشت | هەولێر | بنسای. بنەسای. کەسێك کە رەق و لە رو لاواز بووە. |
| مسکە | | خەندە. |
| مــشتومال کردن | هەولێر | دەمەزەدکردن. تیژکردنەوەی خەنجەر. |
| ملـــــە جاوکانێ | دەشتی هەولێر | دەستگەمە. زۆرانبازی. شەرِشەق. |
| **منە کردن** | گەرمیان | گەرِان بەدوای شتێ. |
| منۆخ | | بێ زاخ. گێل. گەمژە. گەوج. |
| موکەژە | خۆشناوەتی | موسیس. موزەرد و پێست کاڵ. |
| موتاو | | جەواڵی لە مو دروستکراو. |
| مۆشکە | باڵـــــەیی/ باڵەکایەتی | ئازاری گەدە. |
| مـــەرس کردن | گەلاڵـــــە/ باڵەکایەتی | کێلانی چوار دەوری کێلگە و سنوور دیـاری کردنـی. کێلانـی چوار دەوری رێ و سنوور دیاری کردنی. |
| مەشگە | گەرمیان | کاکڵە گوێز. مەژگە لە (مەریوان) گوێزی فەریکە. |
| مـــەکس | | بێدەنگ بوون. دەنگ برِان. گرفتار بوون. کش وماتی. |

| | | |
|---|---|---|
| بوون | | |
| مەکرۆ | هەولێر | بەناز. زۆرزان. هەندێ جار لەبری فێڵباز بەکار دێت. |
| مەلۆ | | باقە گەنمی دروواوە. |
| مەیانە | دیلان/ باڵەیی | خەڵوزی بەرد. هەندێ شوان لایان بوو بۆ ئاگر کردنەوە لە رۆژانی تەڕ و توش و باراناوی دا. |
| مەگێرانی | هەولێر | مەیل. سوێ وحەزی ژنی سك پڕ بۆخواردنێکی تایبەت. |
| میناشکێن | | چاو شکێن. ترساندن. زراو بردن. تۆقاندن. |
| مینەك | | ئەو ولاخەی کە لە کاروان دوادەکەوێت، ولاخی هەرە دوایی کاروان. |
| مێشکە | | ئەو کارەی کە دایکی مردووە. |
| مسڵدان | بەرانەتی | ئێسکی کۆتایی سك. ئێسکی بەری مرۆڤ. |

| | | |
|---|---|---|
| ن | | |
| نائیرو | مەنگوڕایەتی | کەسێکی یان خێزانێکی نەدار. (موحتاج ). |
| نازاو | خۆشناوەتی | ئەو زەویەی فێری زۆر ئاودان کراوە. بە ئاوی کەم شتی تێدا سەوز نابێت یان وشك دەبێت. |
| نادان | بەرانەتی/ هەولێر | پێچەوانەی خانەدان. کەسێکە کاری سوك و چروك و کە دەکات. کەسێکە ڕێز لە خۆی ناگرێ. |
| نا مەکروفی | دەشتی هەولێر | ناجایزی. بە کەڵك نەهاتن. نموونە: (دەڵێن مەکروف نییە بەسەر سێبەرشی دا بڕۆی). |
| نان بەچینە | دەشتی هەولێر | وردکەنان کە دەخرێتە ناو ماست بۆ خواردن یان دەکرێتەدان بۆ پەلەوەر. |
| ناندین | هەولێر | ژووری چێشت تێدا لێنان. هەمان وشە لە قەڵادزێ بە پریاسکەی شوانان دەگوترێ. |
| ناوازە | بلەکێ/ بانە | هەڵبژاردە. جیا لەوانی تر. تاك هەڵکەوتو |
| ناووسك | زاخۆ/ ئامێدی | ئەشکەوتی دەستکرد. |

| | | |
|---|---|---|
| **نخاوتن** | رواندز | داپۆشین. |
| **نزلە** | بێرۆ/ بالیسان | یان(نزرە). سەری کەسێك کە موی هەڵوەریبێ. (اصلح). |
| **نووسنەك** | | گەنە. زیندەوەرێکی بچووکە. خوێنی گیانەوەرانی تر دەمژێ. |
| **نۆ پلان** | خانەقین | جوانو. کۆلەوژ. بەچکەی ماین. |
| **نەبان** | خۆشناوەتی | بزنێك شیر بەکاری خۆی نەدات. بانانەوە (تبنی) کردنی کاری ترە لای بزن و گیانەوەر و پەلەوەرانی تر. |
| **نەتروك** | باڵەیی/ باڵەکایەتی | بیلبیلەی چاو. |
| **نەتەوی** | بانە | زۆڵ. خراپکار. بێمار. شەیتان. هەمان وشە لە شاری مەهاباد واتای دوژمن دەگەیەنی یان ناحەزو دژ. |
| **نەفرەژا** | باڵەیی/ باڵەکایەتی | رەزا قورس. ناحەز. ناخۆشەویست. |
| **نەقەب** | کۆبانێ | نێوان. لەبەینی. |
| **نمونەمام** | خۆشناوەتی | ئەو لقەدارەی یەکەم ساڵ دەردەچێت. |
| **نهۆم** | هەولێر | قات. تەبەقە. هەروەها ژوور. |
| **نیوەنمەك** | هەولێر | هەویر. یان (پیازێکی پیشاو: واتا کەم برژاو) دەخرێتە سەر برینی چکۆلەی پیست بوو، یان کوان و قونێر تا زوو زەرد ببێ و دەربێ. واتا کێم و زوخاوی دەربچێ. |
| **نێرەوز** | باڵەیی/ باڵەکایەتی | پەلەوەری نێرینە. بەچکە گیانەوەری نێرینە. |
| **نێسکە کردن** | ناودەشت | هەڵبەزو دابەزی کارو بەرخ. یاری کاروبەرخ. |

**و**

| | | |
|---|---|---|
| **ورتە** | هەولێر | هاواتای wordوord ی زمانە جێرمانییەکانە. وشە. ئەو دەنگەی لە دەم دەردەچێ. نموونە: بێدەنگ دانیشە. نابێ ورتەت لەدەم بێتەدەر. |
| **وڕکاوی** | | کیناوی. (عیند) |

| | | |
|---|---|---|
| **ورێنجە** | دەشتی دزەیی | وریزە. کەیف. زەوقە. بە گۆلێکیش دەڵێن کە گەشاوەتەوە. نموونە: (ئازاد وریزەی هەیە). |
| **وورِ** | قامشلۆ | فیل. حەول. چاوشاش. وورِ بەواتای گێژیش دێ. |
| **وشکاوز** | | گەنمێك کە لە زەوی بەیاری سالّی پێشوتر چاندرابێ. |
| **وشکەمزە** | سەرگەلّو | بەکرێ گرتنی کرێکار تەنیا بە پارە. خواردن لەسەر خۆیەتی. |
| **وشی بوون** | رواندز | راگیربوون. لەبەر نەرۆیشتن. نموونە: ئاوەکە وشی کرد. خوێنی لوتی وشی کرد. |
| **وشی کردن** | | کۆ کردنەوەی گوڵە گەنمی دوای دروێنەکردن. |
| **ولاّتگیر** | بەرانەتی | پیاوی ئازاو و رەشید. رووداوێکی گەورە و سەرتاسەریی. |
| **وەبێنان** | وەرتێ | بەستنەوە. نموونە: (نەسرینکێ ئەو ئەسپەی وەبێنە). |
| **وەرگێرك** | گوڵان/ شاور | کچێکی تەمەن ١٢- ١٣ ساڵە. کچێك تەمەنی ئەمەندە بێ کە بتوانێ هەندێ ئیشی ناومالّ بکات. |
| **وەرپسی کردن** | بالّەیی/ باڵەکایەتی | غەریبی کردن. بیرکردن. تاسە. |
| **وەستیان** | ئامەد | ماندو بوون. هیلاك بوون. |
| **وێرستن** | وەرتێ | یەخە پێگرتن. نموونە: (دیتم لە پر وێرستی بوو). |
| **وێز** | گەرمیان | گوشەك. بەور. هەروەها یەخە گرتن. پێوە خەریك بوون. |

| | | |
|---|---|---|
| **ی** | | |
| **یاپیکردن** | | بیراز کردن. |
| **یا پیاکردن** | دۆڵی ئاکۆیان | هەیاکردن. قاچ هەڵبرین. خێرا رۆیشتن. |
| **یا دۆست** | دەشتی هەولێر | تەڵە مشکێنە (جۆرە یاریەکی گرەو کردنە). |

| | | |
|---|---|---|
| **هـ** | | |
| **هاتەڤەشکلاندن** | نسێبین | تێك چوو. هەڵوەشایەوە. |
| **هرزۆك** | | گرزەدار، چیلکەی باریك بۆ سوتاندن. |
| **هوج** | بەرانەتی | دوا برِبرِەکانی دواوەی مرۆڤ بە کلێنجەشەوە. نێوان هەردوو |

| | | |
|---|---|---|
| | | نێکی گیاندار کە لە پەلەوەر پێی دەڵێن (قونەجۆڵە) یان (قوندان). |
| هاتـــــە گۆزەرێ | شاور | برینەکە سارێژ بوو. |
| هوت بوون | باڵـــــەیی/ باڵەکایەی | تاسان. |
| هۆزەبانە | باڵەکایەتی | ئەو نوقڵ و شیرینییەیە کە ماڵی تازە منداڵ بوو دەیبەشنەوە. |
| هۆمەن | بانە | هێرش. پەلامار. پڕدانەسەر. هەڵکوتانە سەر. |
| هۆڕ | خۆشناوەتی | شلێڤی گەورە. |
| هۆدان | دەرگەڵـــــە/ رواندز | بەدەنگەوە چوون. چوونە هەردوەزی و یارمەتی دانی کەسێ. (رەنگە وشەکە (لە بری دانەوە) بێت بە یەکتری. نموونە (دوێنی لە دروێنەی زۆر کەسن هاتە هۆدانێ). |
| هەرست | هـــــەروتیان/ هەریر | ئاست. تا راستی: نموونە( هەتا هەرستی باویاش (باویانیش) تێپەڕی هەرا (هەروا) چۆڵە). |
| هەرکاران | بەرانـــــەتی/ هەولێر | بوختان پێکردن. نزا لێخوێندن. ئیرەیی پێ بردن. بەشێوەی (پێ هەرکاران) بەکار دێت واتا قسەی ناڕاست لەسەر بڵاوکردنەوە. نموونە: هەندی پێ هەرکاران تا بەو دەردی چوو گیرا). |
| هەرکەو | وەرتـــــێ/ دۆڵەرەقە | ماقوڕ. ئاوی بەفری تواوە لە ناو چاڵایی بەردان. لە شوێنی بێئاو بۆ خواردنەوەی مرۆڤ گیانەورو باڵندە بەکار دێت. |
| هەرِەیی | | هەرِەمەکی. بەگۆترە. بێ هیچ پێوەندێ. |
| هەشك | وەرتێ | توانا. وزە. شنگ. تاقەت. |
| هەلاژیان | وەرتێ | بۆ رژان. وەنەوز. خەو بردنەوە. توتکەخەو. |
| هەترە بوون | هەولێر | هەرەتە بوون. پەرگەندە بوون. لێك بڵاوبوونەوە. |
| هەڵپەرداوتن | وەرتێ | لێکدانەوەو برینی لقی ورد و باریکی قەدی دار (تقلیم). |
| هەڵپەرچوان | وەرتێ | رەپ بوون. ئەو داردی کە بە ئاو مژین ئەستور دەبێ و |

| | | |
|---|---|---|
| | | هەڵدەپەرچێ. |
| هەڵپیتۆ | بناری کۆسرەت | دردختێکە دەوربەری قەڵەم کرابێت تا زوو گەشە بکات. |
| هەڵخنراو | سوورقاوشـــان/ سوردش | گیانەوەری وشك کراوەو کاتێکراو (تحنیگ). |
| هەڵدەوران | وەرتێ | پەنمان. هەڵمسـان. هەڵئاوسان. نموونە: دەستم هەڵدەورایە. |
| هەڵدەفان | | هەڵمسان. هەڵئاوسان. پەنمان. |
| هەڵەوەڕ | | زۆر بلێ. |
| هەڵوێژنین | وەرتێ | لولدان. نموونە: ئەو لبادەی هەڵوێژنە. |
| هەڵڕوان | | خۆ خافلاندن. خۆ خەریك کردن بێ هوودە. |
| هەڵێم | | شنگ. توانا. وزە. هەشك. |
| هەڵ لوتان | | ساتمە کردن.، نسکۆ بردن. بەدەماکەوتن. |
| هەڵوێشکێ | مەنگوڕایەتی | لە یشکی. لەکاتی. |
| هەنداو | دەشتی هەولێر | دەوروبەر. نزیك (مشارف). |
| هەنواندن | بەڕانەتی | خوساندنەوەی شتێك لە ناو ئاودا. |
| هۆپ | هەولێر | بوەستە. راوەستە. ستۆپ. |
| هەوراودانەوە | گرتك | پەنگ خواردنەوەی ئاو. |
| هەوردبان | | هەیوانێکی لایدە. وەدابڕاو لە ژووری. |
| هەوێرکردن | دەشتی هەولێر | دابڕینی بەرخ و مەڕ لە یەکتری. |
| هێر | دەشتی هەولێر | توانای بەردەوام بوون لەسـەر کارێك. نـوێ بوونـەوەی توانـا و شنگ و تاقەت. نموونە: با هێرم بێتەوە ئینجا کارەکـەی تـەواو دەکەم. |
| هێژبەر | | واتا شێری نێرە. هەروەك (شەپاڵ) بۆ شێری مێیە بەکار دێت. |
| هەیوەشەو | رواندز | مانگە شەو. |
| هـــــەیوان ستاندن | دەرگەڵـــــە/ رواندز | کاتێ کە باران رژد دەبێت و لـە رەشمـاڵ دێتـە ژووری. (رەشماڵ چیتر ئاو راناگرێ). |
| هێـس | وەرتێ | هەروەها پێشی دەڵێن (بنوە نۆڕ). کەسێك یـان گیانـەوەرێکی ملشۆڕ. |
| هەترەش | بەڕانەتی | زراو چوون. تۆقین. بە شێوەی (هەترەشی چوو). |

# پاشکۆ

## نێرومێ لە زمانی کوردیدا

تێرمەکانی نێرو مێ لە زمـان، تایبـەت نـین بـە زمانـە ئـەفرۆ ئاسـیاییەکان (زمانـە سامیەکان). زۆر لە خێزانە زمانەکانی تـریش، شـێوەیەك لـە شـێوەکانی جیاکـاری نێـرو مێیـان، لـە زمانـدا هەیـە. لـەناو ئەوانـەدا ژمارەیـەکی زۆر لـە زمانـەکانی خێزانـی هیندۆئەورووپیش. زۆربەی زمانە هیندۆئەورووپییەکانی وەك ئینگلیـزی و سـویدی، شێوە هەرە ساکارەکەی جیاکاری رەگەزیان لە زماندا ماوە کە بـریتین لـە جیـاوازی لـە راناوی کەسی سێیەمی تـاك (ئـەو، heK she) بـەپێی شـارەزاییم لـە زمـانی سـویدی، جـاران جیاوازی نێرومێ لەو زمانەدا فراوانتر بوو. لە نووسـینە کۆنـەکانی سـویدیدا، بـۆ کـارو پیشەو سیفەت، پاشگری لێکجیا بۆ ژن و پیاو بەکار دەهـات. تـا سـەرەتاکانی سـەدەی بیستیش، ئەم دیاردەیە لە زمانی سویدی بەرچاو بوو. ئێستاش، لە هەندێ دەقدا توشـی ئەم جۆرە پاشگرانە دەبین. لـە دەسـتە سـلاڤیەکانی خێزانـی هیندۆئەورووپیـدا (رووسـی، پۆلۆنی، ئۆکراینی، بولگـاری، سـربی. . هتـد)، جیاکـاری زمـانی لـە نێـوان نێرومـێ و بێلایەندا، زۆر ئاڵۆزترە، چونکە شێوەی رابردوی فرمـان و سـیفەت لـە بارەکـانی تـاك و کۆدا لە خۆ دەگرێت. لە هەندێ زمانی تر تێبینی بوونی دیاردەی نێرو مێ ناکەین، وەك لە فارسیدا.

کە باسی دیاردەی نێرو مێ لە زمانی کوردیدا دێتە گۆرێ، راستەوخۆ بیرمان بۆ لای زاراوەکـانی کرمـانجی و هـەورامی دەچـێ. لـەو دوو زاراوە گرنگـەی زمـانی کوردیـدا، لێکجیاکردنـەوەی نێـرو مـێ، بـە شـێوەیەکی دیـارو بەرچـاو دەبینـدرێ. کـەم و زۆر لێکۆڵینەوە لەسەر نێرو مێ لەو دوو زاراوەیەدا کراوە، بۆیە ئەمە مەبەستی ئێمە نییە.

لەسـەر زاراوەکـانی ناوەراسـتی زمـانی کـوردی (ئـەردەلانی، موکریـانی، بابـانی و سۆرانی)، تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل و مەیدانی، لەسەر نێرو مێ نەکراوە.

ئەم چوار زاراوەی سەرەوە، لەم سـەد سـاڵەی دواییـدا، شـان بـە شـانی یـەکتری، زۆر گەشەیان کردووە و قۆناغێکی دووریان بریوە بەرەو بوون بە زمانی ستانداردو یـەکگرتوی کوردی. گۆرانکاریەکانی باشووری کوردستان، تەکانێکی گەورەی بە زمـانی سـتانداردی

کوردی داوە. ئەو زمانە ئێستا لە هەموو بوارە جۆراوجۆرەکانی زانست، ڕێزە، ڕاگەیاندن و تەکنیکیدا بەکار دێت.

زۆر لە نووسەران و زۆربەی خەڵکی ناسایش، کە بە زمانی کوردی دەدوێن و لە ژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاری دێنن، لەو باوەڕەدان کە لە کوردیدا، هەروەك فارسی، نیشانەکانی نێرو مێ نییە.

ئەوانەی وا بیریان کردۆتەوە کە نێرو مێ لە زمانی کوردیدا، تەنیا لە هەردوو زاراوەی کرمانجی و هەورامیدا هەیە و لە زمانی نووسینماندا نییە یان پوکاوەتەوەو لەناو چووە، توشی هەڵەیەکی گەورە بوون. من هەوڵ دەدەم بە پشتبەستن، بەو دەقانەی کە لە زاری ڕۆژانەی خەڵکەوە وەرم گرتوون و تۆمارم کردوون، بوونی نێرومێ بە بەربڵاوی لە زمانی کوردیدا بسەلمێنم. بێگومان ئەو هەوڵانەی من گشتگرنین و هەموو شوێنێکی کوردستانی نەگرتۆتەوە، بۆیەشە بێکەموکوڕی نییە. هیوادارم بە بڵاوبوونەوەی ئەم بابەتە، زمانزانانی کورد، قۆڵی لێ هەڵماڵن و بکەونە خۆ بۆ کارکردنی پتر لەسەر ئەم تێرمە تا هەموو لایەنەکانی ساغ بکرێنەوەو شوێنی شایستەی خۆی لە ڕێزمانی کوردی پێبدرێت.

من کە تەمەنی منداڵیم لە شاری هەولێر بردۆتە سەر، لەگەڵ زمان پژان و فێربوون و تێگەیشتندا، گوێم لێدەبور کە چۆن خەڵکی ئەو شارەو لادێکانی دەوروبەری لە زمانی ڕۆژانەیاندا، جیاوازیان دەخستە نێوان ناوەکانی نێرومێ. منیش وەکو زۆربەی خەڵکی تر، ئەم کارە سەرنجمی ڕانەکێشابوو. بۆیەکەمین جار کە تێرمی نێرو مێ بەزەقی کەوتە پێشم و ناچاری کردم لەسەری بوەستم، لە سەردەمی تەمەنی پێشمەرگایەتیمدا بوو (١٩٨١_ ١٩٨٩). لەو ساڵانەدا، بە هۆی ژیانی سەختی پارتیزانی، دەبوو هەمیشە بەرێگاوە بین. سەرم لە زۆر ناوچە دا. دۆڵ و دەشت وشاخ. کوێستانی لە بەفر سپی چوەوەو خاکی کاکی بە کاکی گەرمیان. سەرم بە زۆر ماڵدا کرد. لە خانوی قوڕی بەدارەڕای گوندان، یان لە ڕەشماڵ و چیغ و کەپرو هۆبەو هەوارانی کوێستان، لای شوانانی لە وەڕگا، یان لای کچانی ڕێواس و کنگرکەر، ناو پەڵە بەفری تواوەی بەهاران، لام دەدا. دەمدواندن و گوێم لێدەگرتن. هەمیشە بە وردی گوێم رادەدێراو، ئەوەی لام تازەو گرنگ بوو لە دەفتەری کۆڵم تۆمارم دەکرد. دەمزانی ژیانی پێشمەرگایەتی هەلێکی بۆم هێناوەتە پێش، جارێکی تر دووبارە نابێتەوە. بەشێکی زۆری دەفتەرەکانم،

لـه شـەڕو پەلامارەکانـدا، لەناوچـوون. هەندێکیـشی مـاون و سەرچـاوەیەکی گرنگـی نووسینەکانمن.

یـەکێ لـەو تێرمـە زمانەوانیانـەی کـە لـە دەفتەرەکانـدا، شـوێنیان گرتـووە، لێکجیاکردنەوەی نێرو مێیە. ئەو بابەتەی لە لادێکاندا، لە زمانی ڕۆژانـەی خەلکدا بـە ڕوونی دیارە، بەلام لە زمانی نووسراودا پشتگوێ خراوە. لە کتێبەکانی ڕێزمانـدا، بـازی بەسەر دراوە رەنگە هۆیەکی گرنگ ئەوەبێ کە لە زاراوەی بابانی نـاو شـاری سلێمانی، دیاردەی نێرومێ بەرچاو ناکەوێت. بێگومـان لـە شـارە گـەورەکانی تـری کوردستـانیش، خوێندن خەریکە زمانی تایبەت بە چینی خوێندەواران بەکاردێنن کـە شـوێنی نێـرو مـێ تێدایدا بە چۆلی ماوەتـەوە. وا خەریکـە زمـانی نووسـین دەبێتـە (زمـانی سەردەستەی کۆمەل) و تاکە کەرەسەی لێکۆڵینـەوەی مەیـدانی. ئەمـەش وایکـردووە نێرومـێ دیـارو بەرچاو نەبێت.

یەکـەمین دیـاردەی نێرومـێ، کەسـەرنجی ڕاکێشام و لـە پرێـك دەیـان نموونـەی تـری سەردەمی مندالیمی بە بیرهێنایەوە، لە ناوچەی (شێنیێ- نێوزەنگی) پشدەر بـوو، لـە سالی ۱۹۸۱. خەلکی ئەو شوێنانە ناوی ژن و پیاویان بە دوو شێوەی جیا گۆ دەکرد. بۆ ژنان، بەسێ شێوە ناو دەبران:

یەکەم: وەك پورە کەسکێ

گولێ

عەیشێ

بەسێ

فاتێ و هتد.

دووەم: ناوەکە وەکو خۆی و بێگۆڕان بـەکار دەهـات، وەك: پـیرۆز، فـاتم ، ڕێـزان ، نەسرین، بەلام کە ناوو نازناوی مێینە (کەسی سێیەمی تاك) بەیەکەوە دەگوترێت، ئـەوا هەمیشە پاشگری (ێ) دەخرێتە سەر ناوی یەکەمی (ناوی پێش نازناو) کەسی سێیەمی تاك، وەك: ئەسمەرێ قادری نەسرینێ مام عەولای

سێیەم: لە کاتی ناردنی هەوال و پەیام بـۆ ژنێـك (کەسـی سێیەمی تـاك) هەمیـشە پاشگری (ێ) دەخرێتە سەر ناوە مێینەکە، وەك:

بە فاتمێ بلێ بابێت.

نەسرینێ ئاگادار بکەوە.

چیت بە پیرۆزێ گوت؟

هەرچی ناوی نێرینەیە، ئەوا دوو شێوەی گۆ کردنی هەیە.

یەکەم: ناوەکە وەکو خۆی گۆ دەکرێت، وەك: مام مراد، ئازاد، وەسمان.

دووەم: کاتێ کە ناوو نازناوی نێرینە (کەسی سێیەمی تاك) بەیەکەوە دەگوترێت، ئەوا هەمیشە پاشگری (ی) دەخرێتە سەر ناوی یەکەمی (ناوی پێش نازناو) کەسی سێیەمی تاك، وەك: محەمەدی ماملێ

ئازادی حەمەلاو

مەلا ئەحمەدی هەرشەمی

حەمەی عاسیێ

ئەحمەدی خانی

مەلای جزیری

تێبینی/ عاسی وەکو ناوی مێ بەکارهاتووە بۆیە بۆتە عاسیێ.

بەکارهێنانی پاشگری (ێ) بۆ مێیەو پاشگری (ی)بۆ نێرە لە لادێکان و لە شاریش، لە ناو ئەو کەسانەی کە نەخوێندەوارن، یان خوێندەواریان زۆر نییە زۆر بە بەربلاوی بەکار دێت. کەچی خەلکی خوێندەوار، چونکە بە نووسینی ناوەکانیان بە شێوەی عەرەبی راهاتوون، هەست بە هەلەیەك ناکەن گەر ئەو دوو پاشگرەی سەرەوە بەکار بێت یان نا. ئەمەش کاریگەری خراپی زمانی عەرەبییە کە خەریکە دەچێتە ناو رێزمانی کوردییەوەو تێرمێکی گرنگی ئەو رێزمانە دەگۆرێت.

سالانی ١٩٨٢- ١٩٨٣ بە ئەرکی پێشمەرگایەتی، لە ناوچەی دۆلی خانەقای سەر بە شاری رواندز بووم. زۆربەی پێشمەرگەکانی ئەوێ خەلکی ناوچەی بالەکایەتی بوون. بالەکایەتی یەکێ لە ناوچە هەرە دەولەمەندەکانی زمانی دەستلێنەدراوی کوردیە و من سوودی زۆرم لە تێکەلاوی خەلکی ئەو ناوچەیە ببینی. ئەوکاتانە، زۆر لە گوندی (وەرتێ)دەمامەوە. وەرتێ کە دەکەوێتە نێوان رواندزو رانییە، بە ئەندازەی شارۆچکەیەك گەورە بوو. ئەو کات گوندەکە تەواو دابراوو دوورە دەست بوو، وەرتێ فێرگەیەکی گەورەی زمان بوو بۆ ئەوکەسانەی هەلۆەدای تێگەیشتنی باشتری زمانەکەیان بوون. هەر لە وەرتێ تێرمی تازەی نێرومێم بەرگوێ کەوت کە پێشتر بەتەواوی لێیان بێئاگا بووم.

خەلكی وەرتێ، لە جیاتی دەربڕینی (چۆنی) وەکو ناوچەکانی تری هەولێر دەلێن (کوی). لە وەرتێ لێپرسین و سلاولێکردن بە گوێرەی رەگەزی مرۆڤەکە، واتا نێرومێ، دەگۆڕدرێ.

بۆ کەسی یەکەمی تاکی نێر، لە جیاتی **چۆنی** دەگوترێت: **ئی کوی؟**

هەروەها بۆ کەسی سێیەمی تاکی نێریش، دەگوترێت: ئی کوە؟ کە دەکات چۆنە. بۆ کەسی یەکەمی تاکی مێ، لە جیاتی چۆنی، دەگوترێت **ئە کوی؟**

هەروەها بۆ کەسی سێیەمی تاکی مێ، لە جیاتی چۆنە؟ دەگوترێت: **ئەکوە؟** واتا بۆ نێر، پێشگری **(ئی)** بەکار دەهات و بۆ مێش، پێشگری **(ئە)** بەکار دەهات. خەلکی وەرتێ لەم جیاکردنەوەیەدا زۆر وردو لێزان بوون و هەلەیان نەدەکرد. چەند جارێك بەرێکەوت گوێم لێبووە کە پێشمەرگەی ناوچەکانی تر هەولیان داوە وەکو خەلکی گوندەکە، بیان دوێنن و بەهەلە پێشگرەکانیان لێ ئالوگۆر بووە. واتا بە پیاوێکیان گوتوە (ئە کوی؟) ئەیش بە بزەیەکی شەرمنانە خۆی بێدەنگ دەکرد، چونکە دەیزانی لە نەزانییەوە ئەم هەلەیە رویداوە.

دیاردەیەکی تری جیاوازی نێرومێ لە بانگکردنی کەسی یەکەمی تاکی نێرومێ دەبینرا. کاتێ کە بانگی کەسێکی نێر دەکرێت، زۆر جار پاشگری (کە) دەخرێتە سەر ناوی. کەچی کە بانگی کەسێکی مێ دەکرا ئەوا پاشگری (کێ) دەخرا سەر ناوەکەی. نموونەیەکی زیندو، ئەو دایکە وەرتییە بوو کە هەموو ئێواران، لەبەر دەرگای مالەکەی خۆی بانگی دوو مندالەکەی (کوڕێك و کچێك) دەکرد تا بێنەوە مال. دایکە کە هاواری دەکرد، دەیگوت: **حوسێنکە** وەرە نان بخۆ. نەسرینکێ وەرەوە دەرەنگە.

لە بانگکردنی کەسێکی نەناسراو کە ناوی نازاندرێ، یان لەبەر هۆی تر، ناوەکەی ناگوترێت، دیسان جیاوازی زمانەوانی بە گوێرەی توخمی نێرومێ هەیە. بۆ بانگکردنی توخمی مێینە، ئەم ناوانە، بە پاشگری (ێ) بەکار دەهێندرێن:

ژنێ

حورمێ

کچێ

کیژێ

دایک   منداڵان

دادێ (داده)ش بۆ دوانی راستەوخۆ بەکار دێت.

کەچی گەر ئەو کەسەی بانگ دەکرێ و ناوی ناهێندرێت، توخمی نێر بێت، پێڕەوی لە پاشگرێکی تایبەتی ناکرێ ـ وەك:

کاکە -

برا -

کابرا -

کورە -

ئەم جیاوازی کردنە لە نێوان نێرومێدا، وەنەبێ تەنیا لەکاتی وتنی ناوێك یان ناوو نازناوێکدا، بەکار بێت، بەڵکو لە رستەی ئاسایی و ئاخاوتنی رۆژانەدا رەنگی داوەتەوە. دەتوانن چەندان نموونە لە قسەی رۆژانەی خەڵك بنووسینەوە وەك:

بە پیرۆزێ بڵێ.

لەگەڵ پیرۆزێ چوو.

بە نەسرینێ بڵێ با خۆی بۆ خەرێ بگێرێتەوە.

کە هاتیە شار فاتمێش لەگەڵ خۆت بێنە.

کە هاتیە شار حوسێنێش لەگەڵ خۆت بێنە.

بە زێرینێ بڵێ ئازادێ لەخەو هەڵبستێنێ.

بەئازادێ بڵێ.

لەگەڵ ئازادێ چوو.

ئەم جیاوازیکردنە لە نێوان نێرومێدا، لە فۆلکلۆری کوردیشدا رەنگی داوەتەوەو دەبیندرێ. دەتوانین هێما بۆ چەند نموونەیەك بکەین وەك: گۆرانی هەی زێرینێ هەی زێرینێ.

گۆرانی لێ گوڵێ .

لاوکی خانێ لە پزێرین.

پەندی پێشینانی: داکێ ببینە دۆتێ بخوازە، زۆر نموونەی تریش.

نیشانەکانی نێرومێ لە زمانی کوردیدا، هەر بۆ دوو رەگەزەکەی مرۆڤ بەکارنایەت، بەڵکو زۆر لەمە فراوانترو ئاڵۆزترە کە تا ئێستا بەرچاومان خستووە. ناوی شت و

دیارەدەکانیش، هەروەك ناوی مرۆڤـ، بەسەر نێرومێ دابەشکراون. پۆلینکردنی دیاردەو ئەو ناوانەی نێرن و جیاکردنەوەیان لە ناوو دیارەی مێ، بە گوێرەی رێسایەکی تایبەت، بۆ من مەیسەر نەبوو. واتا نەمتوانی رێسایەکی تایبەت بدۆزمەوە کە بەگوێرەی ئەوە، ناو و دیاردەکان بۆ نێرو مێ دابەشکراون. بەلاّم دەکرێ جۆرە پۆلێنکردنێکی سادەتر لەبەر چاو بگرین بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: ئەو ناوانەی پاشگری (ێ) ی مێیان دەچێتە سەر، هەموویان لە باری نەناسراودان. وەك: **ئاسمان، ژوور، دەر، کون، دەشت. . .**

ئەم ناوانەی سەرێ لە کاتی خستنە رستەوە (ێ)ی مێینەیان دەچێتە سەری تائەو کاتەی کە بەشێوەی نەناسراو رەفتاریان لەگەڵ دەکرێت وەك: **لە ئاسمانێ، لە ناوبەیێ، لە ژوورێ، لە مالێ، لە دەرێ، لە کونێ لە دوکانێ، لە مەیدانێ و هیتریش.**

دووەم: هەرهەمان ناوی مێ، کە دەبن بەناوی ناسراو، ئەوا پاشگری (ی) نێرە یان دەخرێتە سەرو پاشگری (ێ)ی مێینە نامێنێ. وەك: لە ئاسمانی حەوتەم، لەناوبەری گوندی، لە ژووری دووەم، لە مالی خۆمان، لە کونی ژوورەوە، لە دوکانی مام عەولاّی، لە مەیدانی کار.

سێیەم: ناوی شوێن و ولاّتان ئەگەر بە نەناسراوی بەکار بێت ئەوا (ێ)ی مێینەی دەچێتە سەر. وەك: **لە بەغدایێ، لە تارانێ، لە ئیرانێ، لە دەشتێ، لە هەولێرێ.**

چوارەم: ئەگەر ناوی شوێن و ولاّتان بە ناسراوی بەکار بێت، ئەوا نیشانەی (ێ)ی مێیە، بۆ نیشانەی (ی) نێرە دەگۆڕێت. وەك: لە بەغدای پایتەخت، لە تارانی پایتەختی ئێران، لە ئیرانی هاوسێمان لە دەشتی هەولێرێ، لە هەولێری پایتەختی کوردستان.

تێبینی یەکەم: هەموو ناوێکی مێینە و هەموو ناوی شوێنێك کە بەیەکێ لە پیتە بزوێنەکان کۆتاییان دێت (ە، ی، ا. . ) ئەوا لەو رێسایەی سەرەوە لادەدەن و هەمیشە لەکاتی بەکارهێناندا نیشانەی (ی) نێرەیان دەچێتە سەر. وەك:

بە گولاّلەی بلێ.

دوێنێ فاتیمەی بینی.

چەند جار لە چەمەی بوی؟

کەی بۆ سلێمانی دەچی؟

تێبینی دووەم: کاتێ کە ناوی شوێن وەکو سیفەت بۆ ناوی کالاّ یان ناوی کەسی بەکار دێت، ئەوا هەمیشە نیشانەی (ی) نێرەی دەچێتە سەر، وەك: کورِە ئێرانییەکە. کالاّی هەرزانی تورکی، قوماشی بەغدایی، رەگەزنامەی عێراقی، کچی هەولێری.

هەموو ئەو ناوانەش کە نیشانەی (ێ)ی مێیەیان ناخرێتە سەر، ئەوا بە ناوی نێرینە دەژمێردرێن و نیشانەی (ی) نێرینە وەردەگرن. وەك: لە عاردی، لەپالّ دیواری، لە شاری، لە گوندی، لە شاخی، لە رووباری خنکا، میری کوردان، دەفتەری خۆم، موسولّمانی باش، جوی کوردستان

ئێستاش، بۆ باشتر تێگەیشتن و دلّنیابوون، چەند نموونەیەك لە قسەی رۆژانەی خەلّك دەنووسمەوە کە لە دەفتەرەکەمدا یادداشتم کردوون:

جلکی خۆت لەبەر بکە.

کلیلی مالّێ لای کێیە؟

لە کەرکوکێ تا هەولێرێ پرخەی دەهات.

لە گوندی تا شاری هەر قسەی کرد.

لە دەشتێ بەپێ هاتینە شاری.

لە ژوورێ دەخەوی یان لەسەری بانی.

لەسەرێ جێت بۆ راخەم یان لە خوارێ.

لە ئاسمانێ بەدوای دەگەرِام لە عاردی دەستم کەوت.

شێخی خۆم نوشتەی باشتر دەکات.

ئاغای گوندی وەك گولّەبورۆژەی دەسوورێ.

مام مۆتکی وەرتی پیاوێکی پیتۆلّ بووە.

پورە کەسکێ رەدوی مام قادری کەوتوە.

* * *

وەك لەو نموونانەی سەرەوەدا دەبینرێ، بوونی نیشانەکانی نێرومێ، بە شێوەیەکی چالاك، لە زمانی رۆژانەی خەلّك و لە دەقە فۆلکلۆریەکاندا، راستییەکە نکۆلّی لێناکرێ. ئەوەی لێرەدا پرسیاری گرنگە ئەمەیە کە ئایا هەر بەردەوام بین لە پشتگوێخستن و بایەخ پێنەدان و دانپێدانەنانی ئەم تیرمە زمانەوانییە؟ یان وەکو بەشێکی گرنگ و بە سوودی رێزمانەکەمان، بایەخی پێبدەین. لێکۆلّینەوەی پێویستی

لەبارەوە بکەین. بیخەینە ناو پرۆگرامەکانی خوێندن. لە نووسینەکانماندا پەیڕەوی لە ڕێساکانی بکەین.

من لام وایە خۆ گێلکردن لەو ڕاستیە زمانەوانییە، زیان بە زمانەکەمان و ڕێزمانەکەشی دەگەیەنێ. پێویستە ئەو تێرمەیە بە گەڕ بخرێتەوەو سوودیشی لێوەر بگیرێ. زمانی ئێمە کۆمەڵێك کەمووکوڕی هەیە، بە دیاریکردنی نیشانەکانی نێرومێ، هەندێ لەو کەمووکوڕیانەی چارەسەر دەکرێن. ئەگەر ئەو پێشنیارەی من. لە لایەن زانکۆکان و کۆڕە زمانەوانییەکان و بنکەکانی چاپ و بڵاوکردنەوە، بەهەند وەربگیرێ و بایەخی پێبدرێ و بڕیاری ئەوە وەربگیرێت کە لە نووسیندا دەبوو پێڕەوی لەو تێرمەیە بکرێت، ئەوا لێکۆڵەوان چەند کارێکی گرنگیان لە پێشە دەبێ یەکلایی بکەنەوە.

یەکەم: دیاریکردنی سیستەمێکی گونجاو بۆ پۆلێن کردن و لێکجیا کردنەوەی هەموو ناوێکی ناو زمانی کوردی ( ناوی کەسی، ناوی شت، ناوی شوێن، ناوی دیاردەکان ) کە ئاخۆ نێرن یان مێن.

دووەم: نەبوونی نیشانەی نێرومێ بۆ ڕاناوی کەسی تاکی سێیەم (ئەوێ. کچ is she) (ئەوی. کوڕhe ) کەلێنێکی گەورەی ناو زمانەکەمانە. من پێشنیار دەکەم بۆ پڕ کردنەوەی ئەو کەلێنە، کە لای چیرۆك و ڕۆماننووسان و وەرگێڕان، باش هەستی پێدەکرێت، دەتوانین سوود لە ڕاناوی هاوشێوەی زاراوەی کرمانجی زمانی کوردی وەربگرین. لە کرمانجیدا، بۆ (ئەو)ی کچ دەگوترێ (وێ)، بۆ (ئەو)ی کوڕیش دەگوترێ (وی) واتا هەمان پاشگرەکانی (ێ و ی) کە لە زمانی ستاندارددا بۆ نیشانەکانی نێرو مێ بەکار دێت. بەم جۆرە **(وێ)** لە جیاتی (she، **هذه**) و **(وی)**ش لە جیاتی (he، **هذا**)، بەکار دێت.

سێیەم: ئەو دوو نیشانەی سەرەوە بۆ نێرومێ، بەسەر گیانەوەری نێر و مێ لە ڕووی فەسلەجییەوە، ناچەسپێ. بۆ نموونە، کەرو ماکە، نیشانەی **(ێ)**مێیان بۆ بەکار دێت وەك: کورتانەکەی لە کەرێ ببەستە. کەچی سەگ، دێڵ و گەماڵی، نیشانەی نێریان بۆ بەکار دێت. وەك: دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە. بەهەمان شێوە، نیشانەی ڕەگەز، پێڕەوی لە ڕەگەزی ڕاستەقینەی گیانەوەران ناکات.

چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە دەکرێ لە لایەن کۆڕێکی زمانەوانیی و بڕیارِ بەدەست چارەسەر بکرێت. کە بڕیارەکانی لە دامودەزگا و زانکۆکاندا پێڕەویان لێبکرێت. بۆ

ـ نموونه دەكرێ بڕیار بدرێت كە نیشانەی نێرومێ بۆ گیانەوەران، بە گوێرەی رەگەزی راستی و فسیۆلۆجی گیانەوەرەكە دابندرێت و بەم شێوەیە كە ناوی هەر گیانەوەرێكی نێرە لە رستەدا بەكاربێنین دەبێ نیشانەی (ی) بخەینە سەر ناوەكە، بۆ گیانەوەری مێش نیشانەی مێیە (یێ) دەخرێتە سەر ناوەكە. وەك بڵێین: ماینێ سپی و ئەسپی كەوێت. دوای چەند ساڵێك پەیرەوی لەم رێسایەكردن، خوێنەران لە گەڵی رادێن و دەبێ بە كارێكی ئاسایی.

**تێبینی (١)**

پێش ئەوەی كۆتایی بەو بابەتە بێنم، جێی خۆیەتی هێما بەو پێشگرە بكەم كەلەناو چەكانی باڵەكایەتی دەخرێنە پێش سیفەت.

وەك تێبینیم كردووە، ئەگەر هەمووشی نا، زۆربەی سیفەتەكان لەناو رستەدا، بە پێشگری نێرینەی (ئی) دەست پێدەكەن، وەك:

هەوا ئی خۆشە.

ئاوەكە ئی ساردە.

كچەكە ئی جوانە.

چایەكە ئی تاڵە.

سەرەڕای گەڕان و سۆراغ كردنیشم، نەم توانی هیچ بارێك تێبینی بكەم كە تێدایدا نیشانەی مێینەی (ئێ) بخرێتە پێش سیفەت. بۆیەش من نەمتوانی دوابڕیار بدەم كە( ) پێش سیفەت نیشانەی نێرینەیە. بەڵام بێگومان بوونی پێشگرێكی تایبەت لەپێش سیفەتدا، دیاردەیەكی زمانەوانییە و پێویستە بایەخی پتری پێ بدرێت.

## سەرچاوەکان


١- دکتۆر جمال رەشید/ لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کورد/ بەغدا ١٩٨٨.

٢- شاسوار هەرشەمی/ مێژووی نارامیەکان لە کوردستان/ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ سلێمانی ١٩٩٩.

٣- شاسوار هەرشەمی/ کارنامەی ئەردەشێری بابەکان/ دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم/ سلێمانی ٢٠٠٠.

٤- ژمارەکانی گۆڤاری چرز/ بەناوی کۆمەڵەی کولتووری کوردی لە نینتسهامن دەرچووە.

٥- عەبدوڵلا غەفور/ جیۆگرافیای دانیشتوانی کوردستان/ پێداچوونەوەی شاسوار هەرشەمی. ستۆکهۆڵم ١٩٩٤.

٦- ق. کوردۆ. ز. یوسف/ فەرهەنگی کوردی -- رووسی. مۆسکۆ ١٩٨٣.

٧- کوردستانی نوێ چاپی دەرەوەی وڵات.

٨- ژمارەیەك فەرهەنگی زمان بە زمانەکانی سویدی، رووسی، فارسی، دەری، عەرەبی، ئینگلیزی، نەرویجی و کوردی.

٩- ژمارەیەك کەشکۆڵ و دەفتەرو پەرەکاغەزی رۆژانی پێشمەرگایەتیم.

١٠- الکسندرامانتکو/ بحثا عنالسعادة. دارالتقدم موسکو ١٩٩٠.

١١- فؤاد حسن حافظ/ تأخ الشعب لأني. القاهرة ١٩٨٦.

١٢- دکتر عبدالحسین زرین کوب/ سرود أهل بخارا. کهنترین نمونة شوبه زبان فارسی/ یغما ١٣٣٧ شماره ٧.

١٣- دکتر علی اشرف صادقی/ تکوین زبان فارسی. تهران انتشارات دانشگاه ازاد ١٣٥٧.

١٤- کلیم الله توحدی/ حرکت تأریخی کرد به خراسان.

١٥- Spruktidningen N. 1 februari 2008. stockholm.

١٦- Kerstin FURUBRANT , världens spruk.
نامۆژگای سیاسەتی دەرەوەی سوید، ستۆکهۆڵم ١٩٨٩

١٧- Coll inder, språket 1959 stockholm.

١٨- L. S. Viktör , Språkpolltik på fem kontinent. Oslo 1977

١٩- B. Malmberg ,språken i tid och rum. Lund 1977

٢٠-فەرهەنگی سویدی – سویدی ئەکادیمیای پادشایەتی سوید Lefin
1992 stockholm

٢١- Spnåktidning en N. 2 april 2008. stockholm

٢٢- Hellquist/ Svensk Etymdogisk ordbok färstq bandt
١٩٩٣ مالمۆ چاپی چوارەم

٢٣- Hellquist/ Svensk Etymologisk ordbok andrq bandt
مالمۆ چاپی ١٩٩٣ چاپی چوارەم

٢٤- Lennorf Warr

## سوپاس و دەست خۆشی بۆ:

- پارێزەر سیروان عزیز
- کاك ئاسۆ
- کاك هاوڕێ
- کاك عومەر

کەیارمەتییان دام لە تایپکردن.

---